کاوسێن بابەکر

# گۆڕان و چاکسازی


مەکتەبی بیرو هۆشیاری(ی.ن.ک)
سلێمانی – گەڕەکی ئاشتی – ١٠٤
شەقامی ئاشتی – ٣٢- ١٠٣٢
ژ. خانوو – ٦٢
www.hoshyari.org
mbh@puknet.org
govarynovin@yahoo.com

**٢٠٠٦**



- **ناوی کتێب: گۆڕان و چاکسازی**
- **نووسینی: کاوسێن بابەکر**
- **تایپ: شاناز رەمزی، کوردستان کەریم**
- **دیزاین: جوان قادر سۆفی**
- **بەرگ: فەهمی جەلال**
- **تیراژ: ١٠٠٠**
- **ژمارەی سپاردن: (٩٠٠ ) ساڵی ٢٠٠٦**
- **لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیرو هۆشیاری(ی.ن.ک)**

# پێرست

# ووته‌یه‌ك





به ده‌نگی بلّند قسه له‌چاكسازیو گۆڕان ده‌كرێ ئه‌وه سه‌ره‌تایه‌كی باشه، به‌لاّم كاتی ئه‌وه هاتووه بكرێ به كرده‌وه، سه‌ره‌تاش پێویسته چاكسازی له‌حزب دا بكرێت، چونكه حزب باشترین وه‌سیله‌ی گۆڕانو چاكسازیه، ترسان له‌چاكسازیو گۆڕان ترسانه له‌پێشكه‌وتنو به‌جێمانه له‌نێو ته‌قلیدو كۆنه خوازیدا، ژیان له‌گۆڕاندایه زانستو ته‌كنۆلوژیا به په‌له به‌ره‌وپێش ده‌چن، پێویسته كه‌لتورو بیركردنه‌وه‌مان به‌رده‌وام موتوربه بكه‌ین به ئایدیای نوێ، بیری نوێ، به‌رده‌وامیش هه‌ژیمان زاخاوی لێبورده‌ییو مرۆڤ دۆستیو نیشتمان په‌روه‌ری بده‌ین، تاكو به چاكسازیو گۆڕان نه‌بینه رێبوارێكی چالاكی دونیای پێشكه‌وتوو، ناتوانین خزمه‌ت به نه‌ته‌وه‌و نیشتمانه‌كه‌مان بكه‌ینو له‌رێگه‌ی ئه‌وانیشه‌وه به‌شێكی چالاكو خزمه‌تگوزاربین بۆ مرۆڤایه‌تی. ئه‌و شه‌پۆلّی گۆڕانه‌ی له‌نێو به جیهانی بووندا وه‌كو زریانێكی توند هه‌لّی كردووه هه‌ردێت، به‌لاّم باخۆمان به‌رنامه‌ی گۆڕانمان هه‌بێ، ئه‌و شتانه بگۆڕینو نوێ بكه‌ینه‌وه كه بۆ گه‌لو نیشتمانه‌كه‌مان به سوده ئه‌گه‌ر نا، به‌ر ته‌پو تۆزی چاكو خراپی گۆڕانه‌كان ده‌كه‌وین، با مێشكو دلّمان بۆ گۆڕانو نوێبونه‌وه بكه‌ینه‌وه، به ئاگایی یه‌وه بچینه نێو پرۆسه‌كه‌وه، بۆ ئه‌وه‌ی به هه‌نگاوی به‌رین له‌گه‌لّ كاروانی پێشكه‌وتن رێ بكه‌ین. وه‌كو خه‌مۆریكی ئه‌م هه‌لّمه‌تی گۆڕان وچاكسازیه، به‌م په‌رتوكه كه كۆبه‌ندی چه‌ند ووتارێكه، به‌شداریه‌كی بچوكی ئه‌و بواره‌م كردووه هیوادارم جێگه‌ی ڕه‌زامه‌ندیتان بێ.

نوسه‌ر

٢٠٠٦/١٠/٢٩

سلێمانی

# گۆڕانكاری له‌ به‌رده‌م*

# كه‌لتور و سیاسه‌تی نه‌ریتگه‌ریدا

**( ده‌توانین ده‌زگا سیاسییه‌كان به‌جۆرێك ڕێك بخه‌ین كه‌ ته‌نانه‌ت حوكمڕانه‌ خراپ و ناشایسته‌كانیش نه‌توانن زیان به‌ كۆمه‌ڵگا بگه‌یه‌نن.)[1]**

**كارل پۆپه‌ر**

* گۆڤاری نۆڤین ژ ٧ ئازاری ٢٠٠٦

[1] كارل پۆپه‌ر٠٠٠ماركۆزوپۆپه‌ر لێكۆڵینه‌وه‌وگفتوگۆ و. ئازاد به‌رزنجی... ل٦٦چاپخانه‌ی شڤان٢٠٠٣.





مێژوویه‌كی دوور و درێژ كه‌لتوری ئێمه‌ له‌ژێر كاریگه‌ری و هه‌ژموونی كه‌لتوری نه‌ته‌وه‌ی ده‌سه‌ڵاتدار بووه‌، ده‌سه‌ڵاتداری كه‌لتوری نه‌ته‌وه‌كانی ده‌وروبه‌ر ده‌رفه‌تێكی باشتریان بۆ خۆیان ڕه‌خساندوه‌، كه‌ هه‌ژموونی هه‌مه‌لایه‌نه‌یان هه‌بێ له‌سه‌ر سه‌راپای ژیانی ئێمه‌ له‌سه‌ر بیركردنه‌وه‌ و سیاسه‌ت و ئابووری ته‌نانه‌ت هه‌ڵسوكه‌وتی كۆمه‌ڵایه‌تیش. نه‌خوێنده‌واری و هه‌ژاری و دواكه‌وتوویی سیاسی و كه‌لتوری زه‌مینه‌یه‌كی باشی ڕه‌خساندوه‌ بۆ چاولێكه‌ری ئه‌و كه‌لتورانه‌ .. كه‌لتوری عێراقی عه‌ره‌بی كه‌ گه‌رای حزبی به‌عسی ترووكاند، ئه‌ویش له‌ماوه‌ی (٣٥) ساڵ حوكمرانی خۆیدا، وانه‌ په‌روه‌رده‌ هه‌میشه‌ییه‌كانی: به‌ موقه‌ده‌سكردنی سه‌رۆكی كاریزمی، موقه‌ده‌سكردنی حزب و فه‌رموده‌كانی حزب و سه‌رۆك و به‌سه‌ربازگه‌كردنی كۆمه‌ڵگاو په‌روه‌رده‌ به‌گشتی كه‌ به‌ئاشكرا ده‌یگووت(به‌یه‌ك گه‌یاندنی فه‌لسه‌فه‌ و ڕه‌فتار مه‌رجێكی بنه‌ڕه‌تی سه‌ربازاندنی په‌روه‌رده‌ییه‌، ده‌وڵه‌مه‌ندكردنی منداڵ و خوێندكار به‌ به‌هاو فه‌لسه‌فه‌ی به‌عس، ڕێگه‌ خۆشده‌كات بۆ تێگه‌یشتنی ئامانجی هه‌ڵگرتنی چه‌ك) ئه‌رك وفه‌رمانی بێ چه‌ندوچوون بوو، ئه‌وه‌ش كۆمه‌ڵگای له‌مه‌نگه‌نه‌ی فه‌لسه‌فه‌ی ئایدیۆلۆژیای تۆتالیتاری حزب و سه‌ركرده‌ی باوكدا بوو! لێره‌وه‌ به‌عس عێراقی كرده‌ سه‌ربازگه‌یه‌ك، وشه‌ی (جه‌ماوه‌ر) یه‌كسان بوو به‌پارچه‌ مێگه‌لێكی بێ زمان و بێ ئه‌قڵ جگه‌ له‌ به‌ڵێ و له‌گه‌ڵتاین ئه‌ی سه‌رۆك هیچی تری پێ نه‌بوو، ئه‌وه‌ش باشترین ڕازو سیفاتی فاشیزمه‌ به‌گشتی. به‌عس گه‌یشتبوه‌ ئه‌و باوه‌ڕه‌ی كه‌ ده‌توانێ گه‌وره‌ترین هێزی ناوچه‌كه‌ بێ و به‌رنامه‌ و ئه‌جندا ڕه‌گه‌زپه‌رستییه‌كانی خۆی بكاته‌ دروشمی هه‌موو عه‌ره‌بێك و به‌سه‌ر دونیاشیدا فه‌رز بكات. هه‌ربۆیه‌ش وشه‌ی فاشیه‌ت دیارده‌یه‌كه‌ له‌(مێگه‌ل) جودا نابێته‌وه‌، لێره‌دا

کەمایەتییەکانیش حسابی هیچیان بۆ ناکریٚ و بەنەبوو دادەنرێن (فاشیەت لەهەرشوێن و کاتێك دانیشت هاوڕێی سیٚ دەرکەوتەی سەرەکییە:

١ـ دیاردەی مێگەل دروستکردن.

٢ـ دروستکردنی کەمایەتییەکی گوناهبار.

٣ـ مۆنۆپۆڵکردنی ڕاگەیاندن.

کەلتوری بەعس، کەلتورێکی تۆتالیتاری فاشیستییە کە بەدرێژایی تەمەنی لەسەر بەسەربازکردنی خەڵك بۆ پێکهێنانی سوپای چەند ملیۆنی کاری دەکردو نەك هەر سەربازی سەربازگە، بەڵکو هەموو تاکێکی عێراقی سەربازێك و لەهەمان کاتدا بەعسییەکیش بوو، کاری بەعس کاری یەك ڕەنگ کردنی کۆمەڵگاو بیٚ دەنگکردنی کۆمەڵگاو دواجار بەمێگەلکردنی کۆمەڵگا بوو، بۆ ئەوەی هەموو کۆمەڵگا لەدوای حزب و لەدوای سەرۆك بن بۆ ئەوەی هێزێکی وەها دروست بکات جەماوەری پیٚ سەر سام بکات،(فاشیەت بەڕای توێژەرەوەکانی وەك (ویلهم رایش، فرۆم، ئەلیاس کاینتی ) وروژاندنی (هەستکردنە بەهێز) خرۆشاندنێکی سایکۆلۆژییە کە دواجار لەوەدا دوایدێت، ئەندامانی گرووپی فاشی هەست بکەن سەر بەهێزێکن وزە و توانا و تەواوی خەڵك و کۆمەڵگایان لەپشتە).

ئەو کەلتورە هەمیشە و بەردەوام دژی جیاوازییەکان ( نەتەوەیی، زمان، بیروڕا ....هتد) کاری کردوەو زۆر بەتوندوتیژی بەگژیان داچووەتەوە و لەنێوی بردوون، مێژووی خوێناوی بەعس، کارەساتە گەورەکانی ئەنفال و ئیعدامکردنە سیاسییەکان و ڕاگواستن و بەعەرەبکردن و بە بەعسکردن و قەتلو عامی شیعەکان و ...هتد بەڵگەی حاشا هەڵنەگرن .. ئەو ڕەفتارانە لەرێگەی





ڕاگەیاندنەکانەوە ماڵ بەماڵ و شار بەشار دەگەڕاو دەرخواردی گەورەو بچوك دەدرا ، لە خوێندنگاکان، لەمەیدانە گشتییەکان لە کۆڕو کۆبوونەوە جەماوەریەکان قسەیان لەسەر دەکراو ڕتووش دەکران و چەپڵەیان بۆ لێدەدرا ، بەعس وایدەکرد ئەو گوتار و ڕەفتارانە ببێتە قەناعەتی سەرجەم خەڵك بۆ ئەوەی پایەی جەماوەری حزب و سەرۆك بۆ هەتا هەتایە دابڕێژرێت. حزبی بەعس نەك باوەڕی بەململانێی سیاسی نەبوو بەڵکو مردن و ژیانی خۆی بەبوونی وەك حزبی سەرکردە گریٚ دابوو کە ئەوەش لە حزبێکی فاشی تەقلیدی تێدەپەڕاند کە خۆی تەنها وەك حزبی زۆرینە پێناسە دەکات.

دیارە خولقانی بەعس بەو سیفات و کارکردانەی بیٚ سەمەرنیە و دەبیٚ ژینگەیەکی کۆمەڵایەتی و کەلتوری گونجاوی هەبیٚ بۆ ڕسکانی باوەڕی توتالیتاری و فاشیزمی وەك بەعس ،سەیرنیە جەنگی قادسیەی یەکەم ،دووەمی لێبکەوێتەوە، تالآن و ئەنفالەکانی نیوە دوورگەی عەرەب و کوردستان و ئێران، ئەنفالەکانی کوردستانی لەسەر دەستی نەوەکانی قەعقاع و خالیدی کوڕی وەلید لیٚ بکەوێتەوە! کەزانیمان کەلتوری عەرەبی عێراق درێژکراوەی کەلتوری عەرەبیە بەگشتی و بارگاویە بە باوەڕی تاك ڕەهەندی ئایینی ئیسلام، تیٚ دەگەین بەعس کە هەڵگری جینەکانی ئەو کەلتورەیە چۆن کار لەسەر ڕەشکردنەوەی ئەوی دی و دروستکردنی کۆمەڵگایەکی تاك ڕەهەند و بیٚ ڕەنگ و مێگەل کە سەرجەم جیاوازییە دینی و فیکری و ئەخلاقییەکانی تێدا قەتڵو عام کراون، دەکات.

ئەم کەلتورە و زمانە سیاسیە بەسەر سەرتاپای نەتەوەی عەرەبدا زاڵە و بەردەوام خۆی بەرهەم دێنێتەوە، تەقلیدی کۆن بەکەمترین بەهای

نوێوه ڕێگه بۆ تەقلیدێکی تر دەکاتەوه ئەوەش کەمترین دەرفەت بۆ ریفۆرم و نوێگەری ناهێلێتەوه، بەردەوام هەنگاوەکانی نوێگەری لەژێر قورسایی کەلتوری تەقلیدی عەرەب کە بارگاوییه بە بەهاکانی باوەڕی موقەدەسی ئیسلامی ئیفلیج دەکرێ (ڕێبازی مێژووی عەرەب له واقیعی سیاسی ئالۆز و پێچەوانەدا لە دایك بوو دەوڵەتی نیشتمانی لە هەرێمە جیاوازەکانی عەرەبیدا لەسەر ئاشتەواییەکی سەر سوڕهێنەری نێوان خۆی و ڕوانگە سیاسی و میراتیەکان کاری کردوه کە هەڵگری زەواجی نێوان دامەزراندنی دامەزراوەی نوێ لەئاستی ڕێکخستنی سیاسی و ئیداری و ئابووردایە) ﴿ڕێکخستن بە زمانی سەدەی هەڤدەهەم﴾ [5] هێشتا سیاسەتی عەرەب بە زمانی سەدەی هەڤدەهەم کاری ڕێکخستن دەکات، لێرەشدا سیستەمێك دێتەدی کە ئەوی دی قبول نییەو نامۆیە بە پرەنسیب و کارکردەکانی دیموکراسی کە بەرهەمی نوێگەری و بەرهەمی مۆدێرنێتەیە (دیموکراسی وەکو فەلسەفەو پراکتیك بەرهەمێکە لە بەرهەمەکانی پرۆژەی نوێگەری سیاسی، ئەوەش لە ئەنجامی ململانێی فیکری بە درێژایی مێژوو کە باوەڕو بەهای نوێ هاتنەکایەوه لە باوەری ئیلیەتی سیاسی ڕکابەر لە مێژووی نوێ و هاوچەرخ دا)[6] لە دۆخێکی ئاوادا تاك هەموو شتێك وەردەگرێ بێ ئەوەی بیری لێ بکاتەوه چونکە لەژێر کاریگەری

[5] - د.كمال عبداللطيف.. أسئلة النهضة العربية مركز دراسات الوحدة العربية بيروت ٢٠٠٣ ص٤٠.

[6] هەمان سەرچاوەی پێشوو.





پەروەردەی باودایە لێرەشەوه تاکە ڕێگایەك بۆ بیرکردنەوەی نوێ خۆ دەربازکردنە لەوشتانەی پێ ی ڕاهاتوین هەر لە منداڵیەوه (هاشم سالح) نوسەری ناسراوی عەرەب دەڵێ (گەر دەرفەتی ئەوەم بۆ هەڵنەکەوتبا کە بەر لە چارەکە سەدەیەك پێش ئێستا بچمە ئەوروپا ئەوا دەژیام و دەشمردم بەبێ ئەوەی هیچ شتێك تێ بگەم)[7] هاتنەدەر لەو ژینگەیە بواری تێڕامان و لێ وورد بوونەوەت بۆ دەڕەخسێنێ، مرۆڤ لەو ژینگەیەدا تا سەر ئێسقان قانگ دراوه بە باوەڕی تۆتالیتاری ، ڕەتکردنەوەی ئەوی دی، ژیان لە خەون و یوتۆپیاکانی نەتەوه پەرستی و مژدە گەورەکانی بەهەشتی هەردووك دونیا ، دروستکردنەوەی خود و کۆمەڵ تەنها لایەنی کەلتوری ناگرێتەوه، پەیوەندی بەقوڵایی باری کۆمەڵایەتی و مێژووییەوه هەیە، تێپەڕاندنی ئەم دۆخی دواکەوتوویی یە پێویستی بە ڕاهێنان و بەدوا داچوونی بەردەوام هەیە لە بارەی دەسەڵات و بەڕێوەبردن و سەرکردایەتیدا.

## کۆمەڵگای کوردی و حزبی کوردی:

[7] هاشم صالح، فیکری خۆراوا، و. شوان ئەحمەد ٢٠٠٥ بیروهۆشیاری (ی. ن. ك).

خوێندنەوەی ئەوەی پێشوو ئەوەمان بۆ ڕوون دەكاتەوە كە كۆمەڵگای ئێمە سەرەڕای كۆمەڵێك جیاوازی كەلتوری و كۆمەلاَیەتی و ئابووری بە حوكمی ژێر دەستەیی سیاسی كەوتووینەتە ژێر كاریگەری و هەژموونی ئەوكەلتورە توتالیتارە، كە ئەوان پەروەردەی مندالەكان و میتۆدی خوێندنی خوێندنگاكانیان دادەڕشت، كە وێنەی سەرۆكی كاریزمی و وتە چەقبەستوو خۆ بەزلزانە فاشیەكانی دەڕازاندەوە، كەم گۆڤارو نامیلكەو كتێب هەبوون پڕنەبن لە (أمة عربیة واحدة ذات رسالة خالیدة) كەم شیعرو چیرۆك و فیلمی سینەمایی هەبوون باس لە ئازایەتی خالیدی كوری وەلید و تالاَن و ئەنفالەكانی قەعقاع و و عبدوللاَی كوڕی عومەر و سەدامیەكانی سەدەی بیستەم نەكەن مندالەكانمان ڕۆژ نەبوو وێنەی هەلكوتانە سەر مالەكانی كەس و كاری (پ.م) و قژ ڕاكێشانی ژنان و چاو سوركردنەوە لە مندالاَن نەبینن، مندالَ و گەنجەكانمان بە درێژایی ٣٥ سالَ لەگەلَ ئەو وێنانە گەورە بوون ئەو كەلتورە سیاسی و كۆمەلاَیەتیە بەزۆر كاریگەری خۆی لەسەر هەلسوكەوت و ڕوانگەو دونیابینی ئێمە جیٚ هێلاَوە، كۆمەلگای ئێمەش كۆمەلگایەكی بیٚ بەری نییە، ڕاستە بە حوكمی شۆڕش و حزبەكانی لە سەردەمی شۆڕشدا و هەلگرتنی دروشمە ئازادی و دیموكراسی خوازەكان پەرچە كردارێكی دروستكردوە لە قورسایی ئەو كەلتورەی كەم كردۆتەوە بەلاَم هێشتا بۆ ڕەگ داكوتانی دیموكراسی بەس نییە (وێنەی نوێگەری سیاسی لە زۆر ڕووكاری سیاسیدا هەیە لە ولاَتەكەماندا بەلاَم بناغەی قوولَی نوێگەری بناغەیك كەوا ڕێگەی نەگەڕانەوەی لەسەر دابنریٚ لە بابەتی چاندنی بەهای نوێگەری لە بیروباوەڕ و كۆمەلگاكەماندا تا ئێستا نییە، بەلكو ئێمە بە دەست زالیٚ ی





زمانێكی خەشەبی كۆن و مردووەوە لە وتارە سیاسیەكاندا دەنالێنێت، زۆرجار هێندێك وێنەی نوێگەری سیاسی لە پەیوەندییەكانیدا لەگەلَ ئەوانی دی بەكاردێنین بۆ ڕازی كردنیان )[8] شتەكان ڕووكەشن قولَ نین، ئەو حزبانەش لە داوێنی كۆمەلگایەكی قانگ دراو بە كەلتورێكی توتالیتاری ئیسلامی كەوتوونەتەوە كە بە شەو و ڕۆژێك ناتوانین سنورو تابۆكانی بشكێنین، ناسیونالیزمی كورد و ڕەوشی سیاسی و پرۆژەو میتۆدەكانی كاركردنی ئەو لە ماوەی سەدەیەكدا لێكۆلێنەوەی زۆر زانستیانەو ڕەنگە لەویش گرنگتر لێكۆلێنەوەی ڕەخنەگرانەی گەرەك بێت، چونكە بەستنەوەی هەموو شكست و تراژیدیایەك بە هۆكاری دەرەكی ستەمی كۆلۆنیالیزم و فشار و پەلاماری ناسیونالیزمی نەتەوە سەردەستەكان كە حەتمەن فاكتەری گرنگن، شتێكی نویٚ نییە. دەیان سالە عەقلی تەمبەلی ناسیونالیزمی كورد ، كە غیرەتی ئەوەی نییە ڕووبەڕووی حەقیقەتی خۆی و هەلەو تێكشكانەكانی خۆی ببێتەوە ئەم بۆچوونە دووپات دەكاتەوە، هەمیشە دوای هەرشكست و هەرەسێك و تراژیدیایەك دەیەویٚ خۆی لە خەتاو بەرپرسیاری دەرباز بكات و هۆكارە دەرەكییەكان بكاتە بنچینە)[9].دەبیٚ چۆن داستانەكانی سەركوتن تۆماردەكەین لەناوهێنانی شكست وهەرەسەكانیشمان نەترسین، ئەگەر لەهەژموونی نەریتی باویش تێبگەین فاكتەرە ناوخۆكانیش باشتر شەرحی حالی خۆیان دەكەن.

( ڕوالەتێكی دیكەی لێكدابڕانی كەلتوری كورد ئەوەیە، لە هەر بەشێكی كوردستاندا تا ڕادەیەكی زۆر دەستەمۆی كەلتوری نەتەوەی سەردەست كراوە،

[8] د.كمال عبدالطيف أسئلة النهضة، ص١١٣.

[9] ڕەفیق سابیر، كولتورو ناسیۆنالیزم، لا٧٢ دووەم چاپ سەردەم سلێمانی ٢٠٠٥.

وەك کەلتورێکی کۆیلە لە پەراوێزی کەلتورێکی نامۆی زاڵدا دەژی و ملکەچی مەرجەکانی ئەوان کراوە، گەرچی شێوەی ژیانەکەی، ئاستی گەشەکردنەکەی و سنووری خەونەکانی لە لایەن کولتوری زاڵ و نوێنەرە سیاسییەکەیەوە دیاری کرابن)[10] کە خاکی داگیرکراوەو کەلتوریشی داگیرکراو بوە و ماوەیەکی دوور و درێژ لەژێر پرۆسیسی وەرگۆڕانی کەلتوری دابوە، کلتوری نەتەوەیەکی خۆبژێوو لەرووی ئابووری وکۆمەلآیەتییەوە وکاریگەری رۆحی و ناتوندوتیژی ئایینی زەردەشتی ومانی بەرەوکلتوری بیابانی توندوتیژ و ئایینی تاقانە و خاوەن حەقیقەتی رەها، لەو پرۆسێسەدا راستە وەك نەتەوە نەتواینەوە و بەربەرەکانێمان کرد و لەرووی سیاسیشەوە دواجار ئەوان رووخان و ئێمە سەرکەوتین، بەلآم پاش ئەوەی بەهاو وێنەکانی فیکر و رەفتاریان کاریگەریی خۆیان بەجێهێشت و تائێستاش لەنێو دیدو بۆچوون و پرۆسەی سیاسی و ئیداری وحیزبی و حکومەتدا دیارە! تێپەرین و رزگاربوون لێی پێویستی بە رەخنەی بەردەوامی بابەتی هەیە، پێویستی بە خەبات و بەربەرەکانێ هەیە لە گەڵ نەریتی سیاسی وکۆمەلآیەتی تۆتالیتاردا، بۆ ئەوەی کۆمەڵگاکەمان بەرەو کۆمەلگایەکی مۆدێرن و کراوە بەرین کۆمەڵگایەك کە دیموکراسی بە کردەوە پیادە بکات و حزبەکانیشی نموونەی جوانی ئاڵوگۆڕی دەسەلآت بن کە گرنگترین پایەی سیستەمی دیموکراسییە (ئەو رێگایەی دەمانگەیەنێتە ئەو کۆمەلگایە رێگایەکە بە تەنها لە کاتی خەبات و لە پێناوی ئەو کۆمەڵگایەدا بەرجەستە دەبێ. ئەوەی ئەتوانین لەو بارەوە بیلێین، ئەوەیە کە بەپێی جیاوازی ولآتەکان

[10] هەمان سەرچاوە.





رێگاکانیش گەلێك لە یەکدی جیاواز دەبن، بەگوێرەی پلەی کاملبوونی سیاسی ئەو ولآتانە، کاملبوونی هێزە بەرهەمهێنەرەکان، کاملبوونی هۆشیاری سیاسی ونەریتی سیاسی و ...هتد )[11] کۆمەڵگای کوردستان و حزبە کوردییەکان پێویستیان بە رەخنە هەیە و بە رێگای تایبەت بە خۆیان کە لەم زەمەنەدا رەخنە و بەخۆ پێداچوونەوەدا هەرە گرنگە کە یانە، "کانت" گوتەنی سەردەمی ئێمە بە شێوەیەکی تایبەت سەردەمی رەخنەیە، دەبێ هەموو شتێك قابیلی رەخنە لێ گرتن بێت، دەبێ خۆمان لەو هەژموونە میراتییەی کەلتوری نەتەوەی سەر دەست رزگاری بکەین، دەبێ بە توندیش رەخنەی لێ بگرین (لە پرۆسەیەکی دوور و درێژدا عەقڵیەتی سیاسی کوردی تەواو تەماهی لەگەڵ خەیاڵ و دونیابینی هێزە داگیرکەرەکاندا کردوە، ماهیەت و چونێتی عەقڵی سیاسی کوردی تەواو وەك ماهیەت و چۆنیەتی عەقڵی هێزە سیاسیە عەرەبی و تورك و فارسەکانە، ستایشی جەماوەر، ستایشی زۆرینە، ملکەچکردن بە کەمینە لە رێگای هێزەوە بۆ زۆرینە رۆحی فاشیزمی عەرەبی و تورکی و فارس بوە، دروستکردنی فەزایەکی سیاسی چوونیەك، کە کەماتییەکی تێکدەری وەك کورد هۆمۆجینیەکەی نەشێوێنێت، ململانێی تیا دروست نەکات، جەوهەری فاشیزمە خۆر هەلآتییەکانە، ئەم عەقڵیەتە بە هەموو رەگەزەکانیەوە گوازراوەتەوە بۆ ناو عەقڵیەتی سیاسیی کوردی. )[12] ئەوە نەخۆشییەکی گەورەیە و دەبێ ئازارێکی ویژدانیمان تێدا دروست بکات،

[11] هربرت مارکۆزە مارکۆزوپۆپەر لێکۆڵینەوەو گفتوگۆ و.ئازاد بەرزنجی لا٩٠ چاپی یەکەم چاپخانەی شڤان سلێمانی.

[12] بەختیارعەلی خوێنەرە کوشندە لا١٤.

بۆچی حزبەکانی ئێمە کە حزبی شۆڕشگێڕ و خاوەن دروشمی دیموکراتین، ئێستا بوونە کەمینە قبوڵ ناکەین! ئێستا لە قەناعەتێکی فیکری دیموکراتییەوە زەمینە بۆ هەڵبژاردنی پاك و بێ لایەن خۆشناکەین و ئەنجامەکانی قبوڵ ناکەین، ئەوە بەرەنجامی پەروەردەیەکی حزبی وکۆمەڵایەتی سەقەتە کە کادیرو ئەندامێك بەرهەم دەهێنێ، زاخاو دراو بە بیرو بۆچوونی حزبی براگەورە، حزبی زۆرینە کە ئەوەش هەمان پەروەردەو ڕوانینەکانی بەعسی لە ناوچوو بوون.

ئێمە بە قوڵی کارمان بۆ زاخاودانی ئەندامان بە باوەڕی دیموکراسی نەکردوە کە هێزێکی دیموکراسی وا دروستبکات، لەنێو حزبەکاندا ببێتە هۆی چەسپاندنی کەلتورێکی دیموکراسی لە کۆتاییدا . ( ژێرخانی زاراوەیی دیموکراسیەت، پشتخانە فیکریەکانی لای ئێمە بە ئەندازەیەك لاوازە، هێشتا ئەو چەکە سەرەتاییانەی نەبەخشیوەتە مرۆڤی کورد، بتوانێت دیاردەکانی کەلتووری فاشی و دژە دێموکراسی لەگەڵ کەلتوری دیموکراسیدا جیابکاتەوە.)[١٣]

حزبەکانی ئێمە چەندە لەگەڵ ئایدیۆلۆژیای تۆتالیتاریی مارکسیزم و ئایین ئاشنان، دوو ئەوەندەش دوورن لە کەلتوری لیبرالیزم، پەیوەندیمان بە دیموکراسییە وە بێ سنور هەژارانەیە! دابو نەریتی کۆن، ئینتما خێڵەکی و گرووپییەکان بەسەر ئینتیما نیشتمانیو نەتەوەییەکاندا زاڵن، ئەوەش بەرەنجامی خۆ کۆپی کردنەوە و شاگەشکەبوون بە دەوروبەر و نزمی ئاستی وشیاری و بێ مبالاتی خەڵکە. قبوڵکردنی هەر ئایدیۆلۆژیا و بیردۆزەیەك،

[١٣] هەمان سەرچاوەی پێشوو.





تەسلیمبوون پێی و وەرگرتنی وەکو شتێکی حەتمی بەرەو دیلێتیمان دەبات (بیردۆزەی حەتمی و بیردۆزەی ڕەها بۆشیکردنەوەی واقعی کۆمەڵایەتی نییە،چونکە ناکۆك دەبێ لەگەڵ تێگەیشتنی دیالێکتیکی بۆخودی مرۆڤایەتی، لێرەوە ئەرکی لێکۆڵەری ڕەخنەگر دێت لە لێکۆڵینەوەی زۆرترین گونجان لەنێوان بیردۆزە و بەرژەوەندیی زۆرینەی کۆمەڵایەتی زۆرلێکراو کە دەیگەیەنێتە تەبابوونی عەقڵ و واقیع... قبوڵکردنی هەر بیردۆزەیەك و تەسلیم بوون و بە حەتمی وەرگرتنی دەمانبا بەرەو زۆرداری و بەکارهێنانی بیردۆزە بۆ پاساو هێنانەوە بۆ هەلومەرجی باو و پاڵپشتی ڕێکخراوە کۆمەڵایەتی و سیاسییە باوەکان لەژێر دروشمی ئەقلانی ساختە دا.)[١٤]

### زەمینەی گۆڕانکاری:

کاتێك دەکرێ هەنگاوی ڕیفۆرم وگۆڕانکاری بنرێت، کە ستراتیژەکەمان دیاری کردبێ و پاشان لە خۆمان بپرسین ڕیفۆرم بۆ ؟ ئامانجەکانی ڕیفۆرم چین ؟ کەرەستەکانی ڕیفۆرم و چی ڕیفۆرم دەکەین ؟

لە سەدەی شانزەهەم لە ئەوروپادا کۆمەڵێك داهێنان و گۆڕانکاری لە بواری زانستی، کۆمەڵایەتی ، ڕووناکبیری ڕوویاندا، کە زەمینە سازی ڕیفۆرم بوون. ئەوان زۆر ئازایانە دەستیان کرد بە لابردنی بەرگریەکانی سەر ڕێگای پێشکەوتن کە یەکەمین بەرگری کڵێساو ئایینی مەسیحی بوون کە زۆر توند بە گژیان داچوونەوە، پاشان سیستەمی سیاسیان گۆڕی .. شۆڕشی فەرەنسای ١٧٨٩ز تائێستاش ئیلهام بەخشی هەموو چاکسازی و ڕیفۆرمێکە،

[١٤] د.قحطان أحمد سليمان الحمدانی النظرية السياسية المعاصرة ل٥٦ دارالحامد للنشر عمان ٢٠٠٣.

**ئەوروپییەكان كە ئەوەیان كرد هیچ پێشینەیەكی دەوڵەمەندیان نەبوو، سەرەتای هەنگاوەكانیان داهێنان بوو، ئێستا كە پێشینەیەكی ڕیفۆرم و گۆڕانكاری ئێجگار دەوڵەمەندمان لە بەردەستە كە دەرس و بەهای نوێیان لێ هەڵبێنجین . ئێستا ئێمە لەڕووی ئیداریشەوە لە قەیرانێكی گەورەدا دەژین، ئیدارەیەك پڕیەتی لە گەندەڵی و نادڵسۆزی،وەفاداری لەنزمترین ئاستی خۆیدایە، كە یەكێكە لە پێشمەرجەكانی هەر فەرمانبەرێك لە هەر دەزگا و حكومەتێك دا، لە ("تێزی وەفاداری" دا، لەگەڵ دووكێشە ڕوو بەڕوو دەبینەوە، دەركردنی ئەو گرووپە لە فەرمانبەرانی حكومەت كە گومانی بێ وەفاییان لێ دەكرێ و قەدەغەكردنی دامەزراندنی ئەو كەسانەی كە گومانی خراپیان لێ دەكرێ)[15] .**

**چاكسازی ئیداری بەندە بە چاكسازی سیاسی چونكە ئیدارە لەلایەن حزبەوە دادەمەزرێ و حزب سیاسەتی كاركردنی ئیداری دادەڕێژێ، كەواتە ئێستا حزب دەتوانێ ڕۆڵێكی سەرەكی لە ڕیفۆرمی ئیداری و كۆمەڵایەتیدا ببینێ، واتە حزب دەتوانێ كەرەستەكانی گۆڕان و چاكسازی پێ بێ و ستراتیژی ئەو گۆڕانەش دیاری بكات و چی وچۆن و بۆچی دەیگۆڕێ و واتا ئامانجەكانی چین ؟ دیاریان بكات و بڵاویان بكاتەوە ! پرسیارێك لێرەدا یەخەمان دەگرێ كام حزبە دەتوانێ ڕیفۆرم بكات، سیفەت و میتۆد و فیكری ئەو حزبە چین ! ئایا حزبێكی نەریتخوازو نامۆ بە كەلتوری دیمۆكراسی دەتوانێ ڕیفۆرم بكاتو چۆن ئەو گۆڕانە دەكات و بە چ ئاقارێك ؟ بەكورتی چی بە چی دەگۆڕێ ؟! (دیارە ناسیۆنالیزمی نەتەوە بندەستەكان، كە خۆیان لە دۆخی دیفاع دان لە**

---

[15] فرانتز نوێمان چەمكی ئازادی سیاسی و د.كاوسین بابەكر لا٥٦ كتێبی بیروهۆشیاری (ی. ن. ك) ٢٠٠٣.





**شوناس و كەلتور دەكرێ نرخ و بەهاكانی دیموكراسیەت وەك پشت و پەنا تەماشا بكەن، بەڵام هەتا لە حاڵەتی بەرگریشدا بە دەگمەن دەبینین بزاوتە ناسیونالسیتەكان هەڵوێستی دیموكراسی وەرگرن. بۆ نمونە ناسیۆنالیزمی كوردی بە دروشم دیموكراسی بوە، بەڵام مێژووی ناسیۆنالیزمی كوردی پەیوەندی ئێجگار كزولاوازمان لەگەڵ دیموكراسیەتدا بۆ ئاشكرا دەكات، ڕۆحی دیموكراسیەت بەنا سیونالیزمی كوردی نامۆبوە.**

**بزووتنەوەی سیاسی نەتەوەی كوردی هێندەی لەسەر لاقی تەقالید و سوننەت، یان لە پەیوەندییەكی ئایدیۆلۆژی بەدین و ماركسیزم پەیڕەو كە بوە نزیكایەتی كەلتوری بەهیچ ئاكارو بنەمایەكی لیبراڵەوە نەبوە٠ بەپێچەوانەوە لەسەر ئاستی كۆمەڵایەتی دا ئەو ناسیونالیزمە بێئەندازە تەقلیدی و دژە كرانەوە بوە)[16] . تاپشێوی و گەندەڵی نەبێ، مرۆڤ بیر لە كۆمەڵگایەكی سەقامگیر و ڕێسادار ناكاتەوە، قەیران پاڵ بە مرۆڤەكانەوە دەنێ ڕیفۆرم و داهێنان بكەن سال سیمون دەڵێ : (پێشكەوتنی ڕۆشنگەری، تاڕادەیەك پشێوی سیستمی كۆمەڵایەتی كۆن و زەروریەتی ڕێكخستنی سەر لەنوێ نیشان دەدات.) بە واتایەكی تر هەموو گوشار و قەیران و شلەژاوێتی و پشێویەكانی سیستمی كۆن، تیوریسێن ناچار دەكەن بیر لە بنیاتنانەوەی سیستەمێكی تازەی سیاسی بكاتەوە .... دەبێ چوار چێوەیەك بۆ((كۆمەڵگای باش )) لە زەینی دا وێنا بكات و ڕێساكانیشی دەستنیشان**

---

[16] بەختیارعەلی خوێنەری كوشندە لا٧٨ .

بكات بەم پێیە تیۆریسیێنەكان (وێنا گەلێكی ڕەمزی لە كۆمەڵگای سەر لە نوێ بنیاتنراو بە دەستەوە ئەدەن.)[17]

ڕیفۆرمی حزبی دەرگا بۆ ڕیفۆرمە كۆمەڵایەتییەكانش دەكاتەوە، چەندە حزب كارابێ لە پەروەردەكردنی كادیر، لە بڵاوكردنەوەی ڕۆشنبیریی سیاسی، لە پیادەكردنی كردەوە دیموكراسیەكان، لە متوربە كردنی كەلتور بە بەهای نوێ بەكرانەوە و بڵاوكردنەوەی باوەڕەكانی ئازادی و بەرهەم هێنانی ناتوندو تیژی، لە دروستكردنی هاووڵاتی وشیار، هێندە زووتر و زیاتر دەتوانێ كەرەستەكانی ڕیفۆرمێكی هەمە لایەن ئامادە بكات، دەتوانێ جیهانێكی نوێ لەسەر دارو و پەردووی ئەم جیهانە كۆنە بنیات بنێ (دەتوانێ قسەی پاڵەوانی یەكێك لە شانۆكانی جۆرج برناردشۆ كە وێردی سەر زمانی ڕۆبێرت كەنەدی بوو دووپات بكاتەوە كە دەڵێ (خەڵكانێكی زۆر شتەكان هەروەك خۆیان دەبینن پرسیار ئەكەن بۆچی؟ من لە زەینمدا ئەو جیهانانە تەسەوەر دەكەم كە هەرگیز بوونیان نەبوە ئەپرسم بۆچی نابێ ئەمانە بوونیان هەبێ ؟ )[18] ریفۆرم دەبێ دەسەڵات بیكات ئەو دەسەڵاتە لەنێو كۆمەڵدابێ یان حزب خۆی یان فشارێك بێ لەنێو حزبدا، ستیڤان ڕابینز گۆڕان بەهێزەوە دەبەستێتەوە و دەیكات بەسێ قۆناغ :

١ـ دەرچوون لە بەستەڵەك.

٢ـ جوڵان بەرەو بارێكی نوێ.

[17] تۆماس سپراكتێز تێگەیشتن لەتیۆرە سیاسیەكان لا١٧٢ خانەی وەرگێڕان ٢٠٠٥ و. فەرشیدی شەریفی. چاپی یەكەم.

[18] هەمان سەرچاوە. لا١٧٣





**٣ـ جێگیركردنی باری نوێ.**

پاشان دەڵێ ( ڕێكخراوێك كەبێ ململانێیە هیچ هێزێكی نێو خۆی بۆ گۆڕانكاری تێدا نییە)[19] حزب ناتوانێ گۆڕانكاری بكات، یان لانی كەم ڕۆلێكی ئیجابی لە ڕیفۆرم دا بگێڕێ كە جورئەتی ریفۆرمی حزبی نەبێ، كە نەتوانێ گۆڕانكارییەكی جددی لە سەراپێی هەیكەلی حزبیدا بكات، كاتێ حزب دەرگا لە وزەو توانای نوێ نەكاتەوە، خۆی لە نەریتی سیاسی دواكەوتوو قوتارناكات، بە بەهای نوێ، دیدی نوێ نەبەخشێتە فیكر و كاركردنی حزب باوەڕی لیبراڵی و دیموكراسی نەكاتە پێڕەوی ڕۆژانە و كادیرانی لەسەر ڕانەهێنێ چۆن دەتوانێ ببێتە فاكتەری گۆڕان؟ (ناسیونالیزم كاتێ دەتوانێ جێگا بۆ دیموكراسیەت بكاتەوە كە بتوانێت توند خۆی بەنوێگەریەوە ببەستێتەوە، نەبێتە ئایدیۆلۆژیای داخران و شكانەوە بەسەر خۆیدا، ڕیشەكانی خۆی بەفیكری لیبراڵەوە ببەستێت، ئامادەییەكی قووڵی دیالۆگ و گوێگرتنی تیابێت، سوننەتە داخراوەكانی كۆمەڵگا وەك سوننەتی پیرۆزی نەتەوە تەماشا نەكات)[20] . ڕێگەی ریفۆرم بە دەرگا كلۆم دراوەكانی نەریتی كۆن و ئایدیۆلۆژیە دۆگما حزبی و دینیەكاندا تێ دەپەڕێ، ڕەخنەی ئازایانەش ئەو دەرگایانە دەكاتەوە، نوێبوونەوە وگۆڕان بێ كێشە و ململانێ نابێ بۆگەیشتن بەڕێبازێكی عەقلانی و خولقێنەر. دەبێ ئازایانە ئەوكۆسپانە ببڕین(بیری نوێ دژی هەرچەشنە نرخاندنی پێش وەخت و ئاودەنگی گشتییە، چونكو هەموو ئەوانە كۆسپ دەخەنە سەررێی گەیشتن بەڕێبازێكی ئەقلانی و خولقێنەر.

[19] ستیڤان رابێنز ململانێ و گۆڕانكاری ڕێكخراوەیی لا١٣ كتێبی ڕوناكبیری ژ٣٠ و. ابوبكر خۆشناو.

[20] بەختیارعەلی خوێنەری كوشندە لا٧٩.

**هەربۆیە شوێنی ئەو ڕێبازە پڕە لە: قەیران، تێکۆشانو، بگرە لە دابڕانیش. هەڵبەت هەر لەبەر ئەوتایبەتمەندییەیە بیری نوێ ڕووی لەداهاتوە هەمیشە ئاوەڵایە بۆ هەر چەشنە وەدیهێنان وفیکری نوێ. بۆیە پێوانی ئەو ڕێبازە پێویستی بە دۆزینەوە، تێکۆشان و ئازادیکی بێوێنە هەیە)[21] ئێمەش دەبێ ئازایەتی شکاندنی ئەو تابۆو قەدەغانەمان هەبێ، ئەم دەرگایانە بشکێنین" کانت" کاتێ ساڵی ١٧٨١ کتێبی ڕەخنەی ئەقڵی پەتی نوسی، هەر قسەیەکی لە تەواوی ئەڵمانیا و تەنانەت ئەوروپاش دەنگی دەدایەوە (میشێل فۆکۆ) پێی وایە (کانت) بە بڵاوکردنەوەی ئەم دەقە گۆڕانێکی لە مێژووی فەلسەفەدا دروست کردوە، ئەویش خۆ خەریك کردنی فەیلەسوفە لەگەڵ کێشە گەورەکانی کۆمەڵگەو سەردەمەکەیدا. کانت یەکێکە لەوانەی تەواوی کتێبەکانی بە وشەی ڕەخنە دەست پێدەکات لە (ڕەخنەی ئەقڵی پەتی، ڕەخنەی ئەقڵی زانستی، ڕەخنەی بەهرەی حوکم ) ئاشکرایە ئەو وتە بەناوبانگەی کانت کە دەڵێ (ڕۆژگاری ئێمە، ڕۆژگاری ڕەخنەیە و پێویستە هەموو شتێك بەر ڕەخنە بدرێت تەنانەت قسە و باسی پیاوانی کڵێساش .. ئەوانە نابێ هەر لەسەرووی ڕەخنەوەبن، چونکە ئەوە مانای بەکەمگرتنی ئەقڵ و کۆسپ خستنە بەردەم پێشکەوتن و پەردەپۆشکردنی حەقیقەت دەگەینێ، کەواتە ڕۆشنگەری مانای ئەوەیە مافی ئەوەمان هەبێت ڕەخنە بگرین، واتا دەست کراوەبین لەوەی زۆر ئازادانە ئەقڵی خۆمان بەگەڕ بخەین و تیۆلۆژیستەکانیش نەتوانن سنوری بۆ دابنێن، ئەو تیۆلۆژیستانەی وەکو**

[21] بێرتران ڤێرژۆڵی.. فەیلەسوفەکانی مۆدێرنێتە و، محمد ڕەحیم ئەحمەدی دەزگای چاپی ئاراس هەولێر٢٠٠٤.





**سێبەری یەزدان بەسەر سەرمانەوە ڕاوەستاون، لەکاتێکدا ئەوانە تەنها مرۆڤن و لەگوناهو هەڵە کردنیش بە دەرنین، ئێستاش کاتی ئەوە هاتوە ئەو دەسەڵاتەیان سنوردار بکەین کە دەرهەق بە ئەقڵ و دەروونی ئینسانەکان بەکاری دەهێنن، ئەویش لە ڕێگەی خستنەڕووی تەفسیرێکی ئەقڵانی بۆ ئایین و پەیامە سەرمەدییەکەی)[22].**

**مرۆڤ کاتێك لەنێو دونیایەك دا چاو دەکاتەوە بەو کەلتور و داب و نەریتەش ڕادێ هەست ناکات لەودیو سنورەکانی ئەم دونیایەی ئەوەوە دونیای کەلتورو نەریتی تر هەن، بۆیە ئاشقی ئەو کەلتورەی خۆی دەبێ (خۆشەویستی بۆ داب و نەریت، مرۆڤی وا لێ کردوە ژیانێکی سەرەتایی بۆ ماوەی نزیکەی ٣ هەزار ساڵ بباتەسەر)[23] توینبی مێژوونوسی ناسراو دەڵێ (سیفاتی سەرەکی کە مەدەنیەت لە ژیانی سەرەتایی جیادەکاتەوە داهێنانە. ژیانی سەرەتایی بریتییە لە نەریت (تقالید) لەکاتێکدا داهێنان ژیانی مەدەنیەتە) داب و نەریت و کەلتوری با و سنور بۆ گەشەی ئەقڵی مرۆڤ دادەنێ، تەنها ئاشنابوون بەکلتوورەکانی گەلانی دونیا و زانست و مەعریفە ڕێگای شکاندنی سنوری نەریتی چەقبەستو بۆ مرۆڤەکان دەکاتەوە (عەقڵی مرۆڤ لەسنوری ئەو قاڵبە تێ ناپەڕێ کەوا کۆمەڵگا بۆی دیاری کردوە ، زۆردارییە داوا لە مرۆڤێك بکەین کە لەنێو مرۆڤە سەرەتاییەکاندا ژیاوە فەلسەفەی ئاڵۆزی وەکو فەلسەفەی برجستۆن یان ماتماتیکی وەکو ماتماتیکی ئەنشتاینمان بۆ بەرهەم**

[22] فیکری خۆرئاوا هاشم صاڵح. . لا٦٦

[23] د.علی وردی. . مهزلة العقل البشري ص١٩.

بێنیّ)[24] ئیللیەتی ڕووناکبیر و شارەزایانی سیاسی بەهێزی فیکر و مەعریفە، دەتوانن پەروەردەیەکی نویّ بەباوەڕە نوێیەکانی مرۆڤایەتی بە فەلسەفەی لیبرالّی و عەلمانیەت دەستپێبکەن، کە ئەمەش ریفۆرم لەئایندەدا مسۆگەرتر دەکات. کۆمەلّگای ئێمە کۆمەلّگایەکی مندالّە هێشتا لە قۆناغەکانی پیّ گەیشتن دایە و تابینەقاقای لە خورافیات و نەریتی کۆندا نقومە (ئێمە لە کۆمەلّێکدا دەژین کە بناغەکەی بەهای دژە ناکۆکییە، دایك و باوك لەمالّەوە، مامۆستا و بەڕێوەبەران لە خوێندنگا و شێوەکانی دیکەی بالاّ دەستی لە گرووپە کۆمەلاّیەتییەکاندا، هەموویان بەشێوەی سروشتی ئەم یادەوەرییەمان تێدا بەهێزدەکەن کە نەسازان و جودایی، نا ڕەزامەندی دەخولّقێنن ئەم ناڕەزامەندیانەش، گرفتیان لەگەلّ دایەو لەئاکامدا دەبنە هۆی بە فیرۆدان و خراپ بوونی سیستەم، بە دلّنیاییەوە نابیّ سەرمان سوڕ بمێنیّ کە ئەو مندالاّنەی لەگەلّ ئەم تیۆرییەدا گەورەدەبن و هەموو جۆرە ململانێیەك بە خراپ لە قەلّەم دەدەن. دەبنە بەڕێوەبەرانی وا کە هەمان ئەو بەهایانە دەپارێزن و ڕەواج پیّ دەدەن)[25] لێرەدا پەروەردەی نەریتی و ئایینی قانگدراو بەخورافات ڕۆلّی سەرەکی دەگێڕن. دونیایەك دروست دەکەن کە حەقیەقەت تەنها لای ئەوانە و لەوان بەو دیودا جگە لە گومڕابوون و کفر و زولّمەت هیچی تری تێدانییە، کە ئەوانیش شایەنی لەنێوبردن و قەتلّوعامن ... ئەو باوەڕانە بە تۆخی و وریایی لای هێندێك و بەکالّی و تەئجیل کراوی لای هێندێکی تر دەبینرێن، کە ڕەنگەکانی سەلەف بۆ نێو سەرجەم کۆمەلّگا و لەوێشەوە بۆ

---

[24] هەمان سەرچاوە. . ل١٢٨.

[25] ستیڤان رایبێنز. .. ململانیّ و گۆڕانکاری ڕێکخراوەیی ل٤١.





نێوگرووپ و ڕێکخراوەکان دەگوێزرێنەوە، نابیّ پێمان وابیّ تەنها حزبە ئیسلامیەکان هەلّگری باوەڕی سەلەفین، چونکە سەلەف لەنێو باوەڕی دینەوە بۆتە کەلتورێکی باو تاڕادەیەك ڕەگەزەکانی ئەم کەلتورە بەشێوەیەك لە شێوەکان چۆتە نێو بەرنامە و قەناعەتی حزبیە عەلمانی وخۆبە دیموکرات زانەکانیشەوە، لەهەلّسوکەوتی ڕۆژانەی سیاسی وکۆمەلاّیەتیدا ڕەنگی داوەتەوە! کە خۆی لە پاراستنی هەلومەرجی باو و خۆپاراستن لەڕوو بەڕوو بوونەوە لەگەلّ ئەو کەلتورە و تەماهیکردن لەگەلّیدا دەبینێتەوە و هەولّی خۆ گونجان لەگەلّیدا دەدات بۆ ڕازیکردنی جەماوەری زۆرینەی هەلّگری ئەم کەلتورە. کە وادەکات چارەسەری ئەقلاّنی بۆ ڕێکخستن و ئیدارەدانی ململانێی نێوان کۆن و نویّ درەنگ پیّ بگات ئەوەش تەمەنی قەیران و کێشە سیاسی و کۆمەلاّیەتیەکان کە پەیوەستن بە نەریتی کۆن درێژبێتەوە و ڕیفۆرمیش جگە لە دروشم شتێکی بۆ نەمێنێتەوە. مرۆڤ ، کاتێك دەتوانیّ گۆڕان بکات کە ئازایانە وەکو کانت دەلّیّ ئەقلّی خۆی بەکاربێنیّ واتا بێتە دەر لەژێر کاریگەری ئەوانی دی بەپێچەوانەوە جگە لە مرۆڤێکی ئیفلیج هیچی تری لیّ پەیدا نابیّ ( لە واقیع دا هەنگاونان لە قۆناغی ئیفلیجیەوە بۆ قۆناغی بەرپرسیارێتی و بەرکەمالّی ئەقلّ، هەروا کارێکی ئاسان نییە، ڕەنگە بەقسە ئاسان بێت، بەلاّم بە کردەوە زۆر گرانە کەسانێك هەن تەنانەت گەر بگەنە تەمەنی شەست سالاّنیش باوکانیان وەکو مندالّ سەیریان دەکەن! مندالّی ئەقلّی دلّنیایمان دەداتیّ، لەبەرئەوەی مانای وایە کەسێکی تر لەباتی ئێمە بڕیار دەدات لێشی بەرپرسیاردەبیّ .کەواتە با بەدرێژایی ژیانمان مندالّ بین، گەورەنەبین ئەمەش ئەو هەلّوێستی دەستەوستانی و ترستۆکیەیە کە "کانت"

سەر کۆنەی دەکات، لەم ڕوانگەیەشەوە تا هەنووکەش گەلانێك هەن هەر مندالّن و گەورە نەبوون)[٢٦].

ریفۆرم لەکۆمەڵگادا لەو جومگانەوە دەستپێدەکات، کە لە باریاندایە دەرگا بۆ گۆڕانکاریی بکەنەوە، ریفۆرم لە ریفۆرمی حزبی، ریفۆرمی ئایینی، ریفۆرمی پەروەردە و فێربوون، ریفۆرمی نەریتەکۆمەڵایەتییەکان و موتوربەکردنیان بەبەهای نوێ دەستپێدەکات، تۆ ناتوانی هەنگاوهەڵبێنی بە ئامانجی پێشخستنی کۆمەڵگا ئەگەر مینەکانی ئایدیۆلۆژیای حزب و ئایین لەژێر هەنگاوەکانت چێنرابن! چۆن دەتوانی دەست بۆ تابۆ و حەرامەکانی کۆمەڵگا و ئایین ببەی ئەگەر ئەوان یەك هەنگاو لە دۆگما و یۆتۆپیا بە حەقیقەت کراوەکانی خۆیان دانەبەزن، لە کۆمەڵگایەکدا ژن تیایدا دەرکراوە، گەنج تیایدا نامۆیە، پەروەردە تیایدا مندالّەکانمان لەسەر وێنەی باپیرەیان فۆتۆکۆپی دەکاتەوە، لە ژینگەیەکدا سەدام و دەیانی تر شێخ زانا و دەیانی تری لە هەناویدا هەڵگرتوە، ئاسان نییە بەبێ ئاشکرا کاری (شەفافیەت) بێ ئازایەتی، بێ باج بێ خەباتی شێلگیرانە بێ پێشینەیەکی مەعریفی کە بووبێتە هێزێکی مادی ریفۆرم بکەی پێویستمان بەڕەخنەی ئاگرین هەیە(شێوازی ڕۆژنامەوانی ئاگرین و دلێرانەی گەنجی چۆن لەسەرگۆڕانکاریی سیاسەتی ئێران کاریگەری داناوە..کۆماری ئیسلامی ئێران هێشتا ڕوی خۆشی بەمۆسیقا نیشان نەداوە، ئەوەش بەڵگەی نەبوونی هیچ ئەستێرەیەکی ڕاستەقینەی پاپە لەئێراندا. بەڵام ئەکبەڕی گەنجی ئەمڕۆژانە پێ دەنێتە

[٢٦] هاشم صالّح. . . فیکری خۆرئاوا لا٦٧.





هەرجێگایەك وەك ئەستێرەکانی پاپ چواردەوری پڕدەبێ لەخەڵك[٢٧]). ئەوە لەنێوکۆمەڵگایەکی تەقلیدی کە ئایین تیایدا دەسەڵاتدارە! بۆئەوەی ریفۆرم بە پراکتیك بکرێ، دەبێ حزبی کوردی لە خۆیەوە دەست پێبکات، دەبێ حکومەتی هەرێم لە ئیدارەکانییەوە دەستپێبکات، دەبێ واقیعی بین دەبێ حەقیقەت خوازبین( نابێ لە خۆت بپرسی کە حەقیقەت کەڵکی هەیە یا کارەساتبارە)[٢٨] دەبێ گوناهەکان بسڕینەوە تاکەی لەژێر باری قورسی گوناه بناڵێنین، لە مینبەری مزگەوتەکانەوە بەردەوام گوناهبار و تاوانباری بەر قاپی خوداین، لەسەر تەختەڕەشی خوێندنگا، لەژووری ماڵەکانمان گوناهمان بەسەردا دادەبارێننو ئیدی گومان لە هەموو شتێك دەکەین، گومان گیانمان دەخوات، نەکا ئەم قسەیەمان ئەم کارەمان گوناه بێت و شەیتان لەبن کلێشەمان دابێ، ئاخر لە ڕێی گوناهەوە ئاسان حوکممان بەسەردا دەکەن، نیتشە گوتەنی(کەشیش لەڕێگەی دروستکردنی گوناهەوە حوکمڕانی دەکات)[٢٩] گوتن گوناهە، دیتن گوناهە، بیستن گوناهە..تەنانەت هەر لەبنچینەدا هێندێك ئەندامی جەستەمان گوناه و شەیتانین! ڕێگای ریفۆرم بە سەرەوبن کردنی هەموو ئەو دید و باوەڕانەدا تێدەپەڕێ .. دەبێ ئایین بچێتەوە مزگەوت و دەست بۆ هەڵسوکەوتی تاك و ژیانی کۆمەڵایەتی ئینسانەکان نەبات، پەروەردە بۆچوونەکانی خۆی لەسەر خوێندکار نەکاتە فەرز و بەناوی حەقیقەتی تاقانە دەرخواردی نەدا، حزب خۆی نەکا بە ئایین و موقەدەس و هێندە شەفاف بێ

[٢٧] ئسکات ماکلیود..یاری لەگەڵ مەرگ علیجناب سرخپەش چاپی سییەم لا٢٥٦ترح نو فارسی.
[٢٨] نیتشە دجال مقدمە لا٢٣نشرپرسش بهار[2] ١٣٧٦شمسی فارسی.
[٢٩] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

نەك خۆی شایەنی گۆڕین بەڵكو ئامرازی گۆڕینی كۆمەڵیش بێ. دەبێ دەنگی ڕەخنە بەرز و زولاڵ بێت، ئەوەش زەمینەیەكی دیموكراسی دەوێ، دیموكراسیش كاتێ پیادە دەكرێ كە بووبێتە قەناعەتی خەڵك و حزبە دەسەڵاتدارەكان(دیموكراسی ڕەوشێكی دیاریكراوە بۆ گەیشتن بە ئەنجامێكی نادیار، بەپێی ئەم ڕەوشە حكومەت بەبێ خوێنڕێژی و لەڕێگای هەڵبژاردنەوە ئاڵوگۆڕ دەكرێ، ئازادی كەمایەتی و نارازییان بۆ هەمیشە مسۆگەر دەكرێ، خاوەن ڕایانی جیاواز، ڕای بەدیل دەخەنە بەرچاو)[30] دەسەڵات مرۆڤ گەندەڵ دەكات، خوی مرۆڤ تێك دەدا، دەبێ هێزێك هەبێ لەسنورێكدا بیوەستێنێ، ئەویش هێزی خەڵكە، لەفەزایكی ئازاددا، ئەوەش ئەزموونی دوورودرێژی مرۆڤ سەلماندویەتی، بۆئەوەی كۆنترۆڵی ئەو گەندەڵییە بكرێ پێویستە (بۆ كۆنترۆڵ و چاودێریی و سنووربەندی دەسەڵات پێویستە ریفۆرمی سیاسی بكرێ و رێكخراوی مەدەنی پێكبهێنرێ و پشتگیری بكرێ، خەڵك متمانەی سیاسی بە خۆیان بكەن تاكو كۆنترۆڵی كۆمەڵایەتی بەشێوەیەكی یاسایی و دیسپلینكراو بەسەر دەوڵەتدا بەڕێوەبەرن)[31] بۆ ریفۆرم پێویستە بەرنامەڕێژی بكرێ و ستراتیژێكی دیاریكراو هەبێ، ئاشكرا و شەفاف بێتە خەمی هەموو هاووڵاتییەكی ویژدان زیندوو بەتایبەت ڕوناكبیران.

## یەكێتی و ریفۆرم:

[30] اكبر گنجی، عالیجناب سرخ پوش مقدمه چاپ سییەم ترح نو ۱۳۷۹شمسی.تهران فارسی.

[31] سعیدحجاریان،جمهوریت:افسون زدایی ازقدرت چاپدوم ترح نو۱۳۷۹تهران فارسی.





یەكێتیی نیشتیمانیی كوردستان هەر لە دامەزراندنییەوە سەرەتایەكی باشی دەستپێكرد، بەوەی خۆی بوە چەتری كۆكردنەوەی چەندان ئایدیۆلۆژی و بیروباوەڕی جیاواز، كە پێشتر نموونەی لە عیراقدا نەبوو، ئەگەرچی ئەودەم بەهۆی زاڵیی ئایدیۆلۆژیای ماركسی و دیسپلینی پۆڵایینی لینینی لە ڕێكخستن و بەڕێوەبردندا لەلایەكو بوونی دەیان هێز و حزبی دژە دیموكرات، نەكرا ببێتە چوارچێوەیەك  بۆ پەروەردەكردنی كادیر بە گیانی لێبووردەیی سیاسی و قبولكردنی ئەوی دی و دووركەوتنەوە لە توندوتیژی كە دواتر بەداخەوە نەمانتوانی ڕێگری لەو شەڕانە بكەین یان لانی كەم خۆمانی لێببوێرین، زیانێكی زۆری نەتەوەیی و حزبیشمان كرد! پرسیارەكە ئێستا ئەوەیە: ئایا ئەو هەلومەرجە سیاسی و كۆمەڵایەتی و كەلتووری و ئایینییەی چەند ساڵی ڕابردوو كە توندوتیژی و شەڕی براكوژی و یەكتر قبوڵنەكردنی لەنێو ئێمەدا سەرجەم حزبە كوردییەكان بە یەكێتیشەوە سەپاندوە چ گۆڕانێكی بەسەردا هاتوە؟ ئایا كارمان بۆگۆڕینی ئەو نەریتە سیاسییە توندوتیژە كردوە؟ ئایا بێ دۆخێكی لیبراڵ بێ قەناعەتی دیموكراسی لەنێو ئەوهەموو حزبە چەكدارەدا كەهێندێكیان نەك باوەڕیان بەدیموكراتیەت نییە، بەڵكو دژە دیموكراتیشن یەكێتی چ شێوازیك بگرێتە بەر بۆ ریفۆرمێكی هەمەلایەن ؟ ئایا یەكێتی  بە تەنها بێ دەستبردن بۆ ریفۆرمی كۆمەڵایەتی، ئایینی، ئیداری كە هاوكار و تەبا بێت لەگەڵ ریفۆرمی سیاسی و ڕێكخراوەیی،بێ بچوكترین گۆڕان لەعەقڵیەتی سیاسی هێزەكانی دەوروبەر و ناوچەكەدا دەتوانێ ریفۆرمێك بكات. یەكێتییەكی نوێ بێتە دی بە میتۆد و فیكرێكی لیبراڵی نوێوە كە شەفافیەت و پلورالیزم و دیموكراسیەت گەوهەرەكانی بن، یەكێتییەك

رەخنە بكاتە پاڵنەرێكی سەرەكی لەنێو سەرجەم دەزگاكانی دا؟ ئایا ڕیفۆرم زەمینەی روناكبیری و گەشەی ئابووری و یۆتۆپیای تیۆریسێن و زانایانی پێویست نییە؟ بۆ وەڵامی ئەو پرسیارانە و زۆری تریش پێویستە بیربكەینەوە و توێژینەوەی جۆراوجۆر و نمونەی جۆراوجۆری ریفۆرمی حزبی وئیداری وكۆمەڵایەتی وڵاتان لەبەرچاو بگرین بەشێنەیی بەڵام بەهەنگاوی سەنگین ریفۆرم بكەین، ئەو بابەتە زۆر زیاتری دەوێ بەهیوای درێژەدان لە ئایندەدا.

***ئەو سەرچاوانەی لەم باسەدا سودی لێ وەرگیراوە:**

**سەرچاوەی كوردی:**

١- ماركۆزوكارل پۆپەر(لێكۆڵینەوە و گفتوگۆ) و: ئازاد بەرزنجی، چاپی یەكەم چاپخانەی شڤان سلێمانی ٢٠٠٣.

٢-د.ئەلبێرت عیسا، خوێندنەوەی بەعس بۆ فاشیزمی مێژوویی، چاپخانەی ڕوون ٢٠٠٤ سلێمانی، وەزارەتی ڕۆشنبیری.

٣-بەختیارعەلی، خوینەری كوشندە، كۆمەڵە وتار، چاپخانەی ڕەنج ٢٠٠٥.

٤-هاشم صالح، فیكری خۆرئاوا كۆمەڵە وتار، و. شوان ئەحمەد، كتێبی بیروهۆشیاری، ٢٠٠٥.





٥-ڕەفیق سابیر، كولتور و ناسیۆنالیزم، چاپ وپەخشی سەردەم دووەم چاپ، سلێمانی ٢٠٠٣.

٦-فرانتز نوێمان، چەمكی ئازادی سیاسی، و.د.كاوسێن بابەكر، كتێبی بیرو هۆشیاری، ٢٠٠٣.

٧-تۆماس پراكینز، تێگەیشتن لە تیۆرە سیاسیەكان، و. فەرشیدی شەریفی، خانە ی وەرگێڕان، ٢٠٠٥.

٨-ستیڤان ڕاپیینز، ململانێ وگۆڕانكاری ڕێكخراوەیی، كتێبی ڕوناكبیری ژ٣٠، و .ابوبكر خۆشناو.

٩-بێرتران ڤێرژۆلی، فێلۆسۆفەكانی مۆدێرنێتە، و. محمد ڕەحیم ئەحمەدی بلاوكراوەكانی ئاراس ژ٢٥٢ هەولێر چاپی یەكەم ٢٠٠٤.

**سەرچاوەفارسییەكان:**

١٠- نیچە، فریدریش ویلهلم، دجال، ترجمە عبد العلی دستغیب نشرپرسش چاپ اول بهار١٣٧٦شمسی.

١١- اكبر گنجی، عالیجناب سرخپوش، چاپ سی ام ترح نو، تهران ١٣٧٩شمسی.

١٢- سعید حجاریان، جمهوریت: افسونزدایی ازقدرت، چاپ دوم ترح نو، تهران١٣٧٩شمسی.

**سەرچاوە عەرەبییەكان:**

١٣-د.كمال عبداللطيف، اسئلة النهظة العربية، دراسات الوحدة العربية بيروت طبعة الأولى ٢٠٠٣.

١٤- د. قحطان أحمد سليمان الحمداني، النظرية السياسية المعاصرة دار الحامد للنشر، عمان ٢٠٠٣.

١٥-د. على الوردى مهزلة العقل البشرى، انتشارات الشريف الرضى الطبعة الأولى ١٩٩٧ طبعة امير، قم.

# بەرێگاوە بەرەو كۆنگرە*

## چەند خەمو خولیاو تێڕامانێك

### كۆنگرە:

یەكێكە لە گرنگترین روداوو دیاردەكانی ژیانی حزبیو پڕ بایەخترینیانە چونكە كۆنگرە ژیانی رێكخراوەییو دەستەڵات دەدات بەو حزبە لەنێوان دوو كۆنگرەدا، هەڵوێستەیەكیشە لە هەمبەر سەرجەم مێژووی ئەو حزبەدا لەژێركەوتنو سەركەوتنەكانی لە رۆژە روونو تاریكەكانی كە تیایدا وانە لە شكستو هەڵەكانی وەردەگرێو سەركەوتنەكانیش دەكاتە دەستەبەری سەركەوتنی زیاترو دیاری بۆ جەماوەر. لەلایەكی تریش كۆنگرە دەستەڵات وەرگرتنەوەیە لە سەركردایەتیو دانی دەستەڵاتە بە ئەندامە سادەكانی ئەو حزبە دیارە مەبەست لە حزبێكی دیموكراتەو لە باشترین پێناسەشدا بۆ دیموكراسی حزبی دەكرێ بڵێین دیموكراسی

* رێبازی نوێ ژ/٢١





بریتیە لە (كۆنترۆڵی گشتی بەسەر بڕیاری بە كۆمەڵو یەكسانی ماف لەجێبەجێكردنی ئەو كۆنترۆڵەدا)[1].

كۆنگرە جارێكی تر ئیكۆلۆژیای بەڕێوەبردنو پراكتیكی خۆی هەڵدەسەنگێنێتەوە كە بریتیە لە (ئەو ژینگەیەی كە رێكخراو مامەڵەو كاری تێدا دەكاتو بە پلەی جیاواز كار دەكاتە سەر چالاكیەكانی، ئەو رێكخراوەی كە بتوانێ هاوسەنگی رابگرێو خۆ لەگەڵ ژینگەدا بسازێنێ دەتوانێ بمێنێتەوەو بەردەوام درێژە بە چالاكیەكانی خۆی بدات)[2]. گۆڕانكاریە ژینگەییەكانیش كە خۆیان لە مێژوو، جوگرافیا، ئابوری، كۆمەڵایەتی، كەلتوری، سیاسی،تەكنۆلۆژیادا دەبیننەوە لە گۆڕانكاری بەردەوام دانو حزبی زیندوش دەبێ پێ بە پێی ئەو هۆكارە ژینگەییانە جێگەو رۆڵو كاركرنی خۆی بە ئاڕاستەی بەرەو پێش بگۆڕێ، بەشێوەیەك بەرنامەو دروشمەكانی وەڵامدەرەوەی پێداویستیەكانی سەردەم بێ.

### یەكێتیی نیشتمانیی كوردستانو كۆنگرە:

ئەوەی تائێستا دەربارەی یەكێتی زانراوە لە ژیانی رێكخراوەییو رێبازی سیاسیو ستراتیژو تاكتیكی حزبی دا، زیندوێتیو دینامیكیەتی ئەو رێكخراوەیە بە درێژایی گۆڕانكارە ژینگەییەكان، واتە یەكێتی هەرگیز

[1] دیڤید بیتهام– كوین بویل، دەربارەی دیموكراسی، ل٢ نامیلكەی روناكبیری ژمارە ٣٣

[2] رەفیق سالَح، بەڕێوەبردنو سیاسەت، لاپەرە ١٥ نامیلكەی رووناكبیری ژمارە ٢٧

خۆی بەبیری دۆگماو چەقبەستووەوە نەبەستۆتەوە، کەللەڕەقی بەرانبەر بە گۆڕانکاریەکان نەنواندووە، بەپێچەوانەوە هەمیشە لەنوێ بونەوەو کاژ فڕێدان دا بووە هەر ئەوەش یەکێتی بەرەو بەرین بوونەوەو فراژوو بوون بردووە.

هەمیشە بەشێوازێکی نەرمو باوەشێکی کراوەوە کاری کردووە، زوو زوو خۆی لەگەڵ هەلومەرجی نوێ راهێناوە. دەتوانین بڵێین فەلسەفەی دروست بوونی یەکێتی فرەییو کراوەییو نوێخوازی بووە، هەروەك لە نامیلکەی ی.ن.ك بۆچی؟ دا روون کراوەتەوەو یەکێتی وەکو نیمچە بەرەیەك کە تیایدا بیروباوەڕی جۆراوجۆری سەر گۆڕەپانی کوردستان بانگهێشت دەکات بۆ هاو خەباتیو پێکەوە کارکردن، کە ئەمەش داهێنانێکی نوێ بوو کە پێشتر مێژووی جوولانەوەی کورد بەخۆوەی نەدیبوو، بەکردەوەش ئەو رۆحە دیموکراسیە جێبەجێکرا لە پێکهێنانی یەکێتیدا لە باڵی میانەو چەپو مەیلی سیاسی هەمە جۆر ئەوەش لە حاڵەتی شۆڕشی چەکدار دا زۆر دژوارە بەڵام وەکو ئەزمونێك تارادەیەك بەوردی بخوێنرێتەوە کە: حزبە تۆتالیتاریو خاوەن ئایدۆلۆژیە توندەکان لە دونیادا وجودیان هەبوو ئەوانیش بەپێی خۆیان کاریان دەکردە سەرکاری رێکخراوەیی لە کوردستاندا. ژینگەی خەباتی سیاسی سەختو هەرەسی شۆڕشی ئەیلول هێشتا تەپوتۆزی هەڕەشەکانی نەنیشتبوونەوە، رژێمی بەغداش لەوپەڕی دەسەڵاتو دڕندەییدا لافی سەرکەوتنی لێدەدا لەژینگەیەکی ئاوادا کۆکردنەوەی رێبازو بیرو رەهەندی جیاجیا لەیەك رێکخراودا کارێکی هەروا سانانەبوو، بەڵام بوونی گیانی سەردەمانەو دیدگای دیموکراسیانە لەنێو خەمخۆرانی یەکێتیدا ئەو خەونەی





هێنایەدیو چەند باڵو رێبازی سیاسی جیاجیا لەژێر ساباتی یەکێتیدا یەکیان گرتەوە، خاڵە هاوبەشەکانیان گەش کردەوەو جیاوازیەکانیشیان بۆ دیالۆگی هێمنانە بەجێ هێشت. ئەمەش باشترین نموونەی پێکەوە ژیانی حزبی بوو لەمێژووی شۆڕشی کوردستان دا بێتە دی.

پاشان ئەوەبوو کۆنگرەی یەکەمی یەکێتیساڵی (١٩٩٢) بڕیارێکی ئازایانەتریدا کە سەرجەم باڵەکانی لەیەك رێکخستندا کۆکردەوە ئەمەش وەڵامدانەوەیەکی ژیرانەی ئاڵوگۆڕیەکانی سەردەم بوو کە: یەکێتی سۆڤیەت هەڵوەشابۆوەو بەمەش جولانەوە چەپو کرێکاریەکان هەم بێ پشتیوان مابوونەوەو هەم هەرەسی هەڵوەشانەوەشی تووشی رامانو چاوخشاندنەوەی بە سەرجەم فەلسەفەو میتۆدی مارکسیزم _لینیزم کردە ئەرکێکی هەنووکەیی کە هانیدان بۆ لە مەحەکی پراکتیك دانەوەی، ئیدی کاتی ئەوە هاتبوو واقیعبینانە تر لە پێکهاتەی حزبو حزبایەتی بنۆڕین، ئایدۆلۆژیاش چیدی تاکە مینبەرو ئایەت بوونی خۆی نە دەپاراست. سەردەم سەردەمی کرانەوەو دیموکراسیو فرەیی بوو تایبەت بۆ گەلێکی ژێردەستەی وەکو کورد کە راپەڕین دەرگای سەردەمێکی نوێی لێ کردبۆوە هێندەی ستراتیژ مانەوەو چەسپاندنی ناسنامە بوو کە ئەویش خۆی لە پاراستنی دەسکەوتەکانی راپەڕیندا دەدیتەوە، مشتومڕی، ئایدۆلۆژی هێندە گرنگ نەبوو بۆیە رێبازی سۆسیال دیموکرات وەکو ئەزموونێکی سەرکەوتوو میتۆدو فەلسەفەیەکی کراوە کە تیایدا مافی مرۆڤو ئازادی تاکەکەسو گەشەدانی کۆمەڵایەتیو مافی نەتەوەکانو بازاڕی ئازادو.... هتد بەباشترین شێوە تەعبیری لێکراو

بوو بە خاڵی یەكگرتنەوەی هەموو باڵەكانی ناو یەكێتی، لەولاشەوە پرەنسیپی دیموكراسی مینبەری جیاجیای بۆ هەناسەدانی بیروڕای جیاجیا فەراهەم كرد. بۆیە پتەوكردنی یەكێتی ناو یەكێتیو بەهێزكردنی ڕێكخستنو دامەزراندنی هێزی پێشمەرگە بۆ ئاراستەكردنو وەگەڕخستنی سەرجەم كۆمەڵانی خەڵك بۆ هاتنەمەیدانو پاراستنیو سەرخستنی ڕاپەڕین ئەركێكی هەنووكەیی بێ ئەملاو ئەولای كۆنگرە بوو كە دواتریش لە هەڵبژاردنی پەرلەمانو دامەزراندنی حكومەتی هەرێمدا ئەو ئەركە نمایان بوو.

## بەرەو كۆنگرەی دووەم:

ئێستاش نۆ ساڵ تێدەپەڕێ بەسەر كۆنگرەی یەكەمدا كە دەیان گۆڕانكاریو دیاردەو دەركەوتەی سیاسی، كلتوری، سەربازی، ئابووری چ لە ئاستی ناوچەكەو چ لە ئاستی جیهاندا ڕوویانداوە كە هەڵوێستەو تێڕامانیان كەرەگە كە پێویست بە وەڵامی ژیرانەی مێژووییو دروست دەكات. تەنانەت ژیانی نێوخۆیی حزبیش سەركردایەتی، دەزگاكان، ڕێكخستن، هێزی پێشمەرگە، پێویستیان بە تێڕامانو لێتوێژینەوە هەیە بۆئەوەی یەكێتی بەگوڕو تینێكی بەهێزترو تازەتر لە سەدەو هەزارەی نوێ دا بێتەوە نێو ڕووداوەكان. دیارە بەپێی (پەیڕەوی ناوخۆ خاڵی دووەمی بڕگەی یازدە)[3] هەر دوو ساڵ جارێك پێویستە كۆنگرە ببەسترێ بەڵام هەلومەرجی نالەباری

[3] پەیڕەوی ناوخۆو بەرنامەی یەكێتی، پەسەندكراوی كۆنگرەی یەكەم ساڵی ١٩٩٢.





سیاسیو شەڕو گێچەڵەكانی ناوخۆ بواری بەستنی كۆنگرەیان نەدا، ئێستاش یەكێتی بچووكترین دەرفەت بۆبەستنی كۆنگرە دەقۆزێتەوە، ئەوەش متمانەو باوەڕی پتەوی یەكێتیە بەسەرجەم ئەندامانی كە هێشتا هەلومەرج لە ئاستی پێویستدا نیە.

كۆنگرە لەسەریەتی ستراتیژو تاكتیكی گونجاو بەپێی ژینگەی نوێو دیاردەو دەركەوتە تازەكان دیاری بكاتەوەو ڕێبازی سیاسی خۆی لەبەر ڕۆشنایی هەلومەرجی نوێ دیاری بكات.

ئەو ئەركانەی لە ئەستۆی كۆنگرەی یەكەمدا بوون هەر لە یەكێتی ناو یەكێتی، بوژانەوەو بەهێزكردنی ڕێكخستن، تۆكمەكردنی هێزی پێشمەرگە، پاراستنی دەسكەوتەكانی ڕاپەڕین، ئاوەدانكردنەوەو بوژاندنەوەی ژێرخانی ئابووری،... هتد. هێشتا لەو ئەركانەن كەدەبێ كۆنگرەی دووەم ڕەچاویان بكات چونكە حكومەتی هەرێمو دەسكەوتەكانی ڕاپەڕین لە هەڕەشەی دوژمنان نەرەخساون، هێشتا بەهێزكردنی یەكێتی لەسەرجەم بوارەكاندا دەستەبەری سەرەكی سەرخستنی كاروانی ڕزگاریو ئازادی نەتەوەییە، بۆیە پێویستە كۆنگرە پێ لەسەر ئەو ئەركانە دابگرێتەوەو مشتومڕ لەسەر ڕێوشوێنی گونجاو بۆ سەرجەم ئەو ئەركانە بكات. بۆئەوەی یەكێتی وەك پێشەی هەمیشە لەگەڵ گۆڕانكاریەكاندا خۆی تازەبكاتەوە، دەبێ بەداهێنانی تازەو شێوازی نوێ لە كۆنگرە بێتەدەر.

## دەستەڵاتو دیموكراسی:

پێویستە دەسەڵات چوارچێوەیەکی دیموکراسی هەبێ، چەندە دەسەڵات پرەنسیپی دیموکراسی بکاتە پێناوی، هێندە هەوادارو پشتیوان بۆ ئەو حزبە فراوان دەبێ، بەپێچەوانەشەوە چەندە دەسەڵات وشەی دیموکراسی بەرتەسك بکاتەوە چ لەنێوخۆی حزبداو چ لەدەرەوە هێندە ناحەز بۆخۆیو بۆ حزب پەیدا دەکات، دیارە بوونی ناحەزیش لە کۆمەڵگایەکدا کە پەرلەمانو هەڵبژاردن دەکاتە پردی پەڕینەوە بۆسەر کورسی دەسەڵات چەندە خەتەرو دژوارە.

یەکێتی کە دروشمی دیموکراسی بۆ نێوخۆو بۆ کۆمەڵگاو دەستەڵاتیش بەرز کردۆتەوە دەبێت دیموکراسیو دەسەڵات وا یەکاڵای یەکتر بکات کەڕەنگدانەوەی بۆسەر کۆمەڵگاش هەبێت بۆئەوەی دیموکراسیش باشتر هەناسە بدات زیندووتر ممارەسە بکرێ وا چاکە چەند سەرچاوەی دەسەڵات هەبن واتە دابەشاندنی دەسەڵات، سەرکردایەتی بە کۆمەڵ کە کۆنگرە شەرعیەتی دەداتێ پرەنسیپێکی سەرەتایی دیموکراسیو جوانکردنی دەسەڵاتە لەنێو دوو کۆنگرەدا چونکە بەبوونی چەند ئۆرگانێکی دەسەڵات، دیموکراسی باشتر دەچێتە ناو هەناوی حزبیو کار لە ڕەفتاری تاك تاکی حزبو کۆمەڵ دەکات، لێرەشدا یەکێتی هێزی زیاتر لە دیموکراسی وەردەگرێت. بۆ نموونە دەکرێ لیژنەو ئەنجوومەن بۆ هەڵبژاردن پێك بهێنرێن کە خاوەنی دەسەڵات بن بۆ بەدواداچوونو چاودێری یان دروستکردنی بڕیار لەمەڕ کێشەکانی نێوخۆی حزبو دەرەوە شان بەشانی (م.س). جگە لەوەی ئەرکێکی زۆر خراوەتە سەر سکرتێری گشتی کە بواری لەبەردەمدا تەسك دەکاتەوە بۆ کاری جدیترو





حەساستر کە ئەو ئەنجوومەنە یان لیژنەیە دەتوانێ پارەسەنگێك بۆ ئەو ئەرکانە ڕاگرێ.

**سەرکردایەتی:**

١. هەڵبژاردنی ئەندامانی سەرکردایەتی لە چوارچێوەی پرەنسیپی حزبیدا بەپێی پێوەرێکی گونجاو جێبەجێ دەکرێت جگە لە مێژووو کەسایەتیو دڵسۆزیو ئاستی وشیاریو سیاسی _فکری واباشترە لایەنی پسپۆری لەبەرچاو بگیرێ.

٢. بۆ هەڵبژاردنی سەرکردایەتی، تایبەتمەندی ناوچەییو جوگرافیای شارەکان گرنگی خۆی دەبێ لە سەرکردایەتیو کۆکردنەوەی زۆرترین جەماوەر لەدەوری دروشمو بەرنامەکانی حزب.

٣. ئەندامی نوێو چالاك خوێنو وزەیەکی تازە بە حزب دەبەخشێو هەم بە ئەزموون کردنی هەڤاڵانیش لەکاری سەرکردایەتیدا.

٤. پێكهێنانی لیژنەی پسپۆڕی جیاجیا لەسەركردایەتیدا بۆ بوارە جیاجیاكانی یاسایی، ڕاگەیاندن، كۆمەڵایەتی،....هتد. گرنگی خۆی هەیە لە ئاسانكاریو پێڕاگەیشتن دا.

**ڕێبازی سیاسی:**

ڕەوتی سیاسیو فەلسەفیو فكری سۆشیال دیموكرات لە ئەزموونەكانی دنیادا هەم لە ململانێكاندا لەپێشەوە بوون، هەم زۆرترین دەسكەوتی سیاسی، ئابووری، كۆمەڵایەتی، كلتووریان بۆ گەلەكانیان هێناوە، ئەو ڕێبازە بۆ یەكێتیش وەرچەرخانێكی گرنگ بوو هەم بۆ ئاشنابوونی زیاتر بە دیموكراسیو ئەزموونی سۆشیال دیموكرات هەم بۆ پرۆڤەكردنی سەرەتاكانی ئەم بیرو فەلسەفەیە، بۆیە قوولكردنەوەو بە كوردایەتی كردنی ئەو ڕێبازەو موتوربەو پاراوكردنی بەبیری نەتەوەیی پێشكەوتنخوازانە بەشێوەیەك كە هاوسەنگ بێت لەگەڵ ژینگەی سیاسی كوردەواریدا كارێكی پێویستەو هەقە زیاتر تاووتوێ بكرێت.

**پەیوەندییەكان:**

پلانی سیاسی، بەرژەوەندیەكان ڕەنگڕێژی كەوشەنەكانی دەكەن، كاتێكیش ئامانج دەپێكێ كە كەرستەكانی سەركەوتنی فەراهەم كرابێ، لەدونیای پڕگێرەو كێشەی ئەمڕۆشدا خاڵی مومكینو نامومكین هەیە





چونكە سیاسەت لە ئەرزی واقعدا دەكرێ، زۆرجار واپێویست دەكات بۆ بەدەست هێنانی ئامانجێكی نەتەوەیی قوربانی بە بەرژەوەندیەكی تر بدرێ دیارە بەرژەوەندیە باڵاكانی نیشتمانو نەتەوە ئەو چوارچێوەیە بوون كە پەیوەندییەكانی یەكێتیان لەگەڵ حزبو لایەنەكان، هێزە ئیقلیمیەكان لە خۆگرتووە بەڵام پاراستنی هاوسەنگی لەنێو هێزەكاندا لەناوخۆو دەرەوەدا هەژموونی خۆی بەسەر دانوستانی بەرژەوەندیەكاندا دەسەپێنێ، بەڵام دەبێ ئەوە لەبەرچاو بگیرێ كە یەكێتی وەكو دەسكەوتو بەرژەوەندیەكی گرنگی نەتەوەییو نیشتمانی لە مامەڵە لەگەڵ بەرژەوەندیە نیشتمانیەكاندا حسابی جدی لەسەر بكرێ. لەهەر قەیرانو كێشەیەكی سیاسی سەربازیدا یەكێتی لە بەرژەوەندیە باڵاكانی نەتەوە بێتە هەژماردن، بەو پێیەش لە دانوستانو بڕیاری سیاسیدا چ بۆ ئێستاو چ بۆ ئایندە ئەم خاڵە فەرامۆش نەكرێ. واتە لە هەر كێشەو هاوكێشەیەكدا یەكێتی بخرێتە تای تەرازووی بەرژەوەندیە باڵاكانی نەتەوە بەو مانایەی یەكێتی جگە لەوەی وەسیلەیەكە بۆ بەدەستهێنانی بەرژەوەندییەكانی نەتەوە خۆشی یەكێكە لە دەسكەوتو بەرژەوەندیەكانی نەتەوە هەر بە گوێرەی ئەو پرەنسیپەش پەیوەندی یەكێتیو حكومەتی هەرێم لەگەڵ هێزە ئیقلیمیەكانو حزبە كوردستانیو عێراقیەكاندا پەیوەندی دامەزرێنرێو لەشەڕو ئاشتیشدا بەو پێودانگە مامەڵەی لەگەڵ بكرێ.

**ڕێكخستن:**

رێكخستن باشترین دەستەبەری بە جەماوەریكردنی هەر حزبێكە، یەكێتی مێژووی تێكۆشانو هەڵویستە نیشتمانیو نەتەوەییەكانی جەماوەرێكی زۆری بۆ پەیدا كردووە هەر چەندە نەتوانراوە ئەو جەماوەرە وەكو پێویست رێك بخرێ، بەمەش زۆرترین سوود لەوزەو توانای ئەو جەماوەرە وەربگرێ، بۆیە پێویستە شێوازی گونجاوترو باشتر بۆ رێكخستنیان فەراهەم بكرێ، واباشترە كەڵك لە هەردوو جۆرێ رێكخستن، رێكخستنی جەماوەریو رێكخستنی بە دیسپلینو شانەبەند، لە هەردوو ئاستی پیشەییو گەڕەك وەربگیرێ كۆمیتەكانیش لێپرسراوەكانیان لە ئاستی سەركردایەتی دابن باشترە.

## مەكتەبی رێكخراوە دیموكراسیەكان:

ئەو مەكتەبە دیوێكی دیكەی رێكخستنەو چەندە كاری تێدا بكرێت هێندە ئایندە دەكاتە موڵكی یەكێتی، جگە لەوەی دەروازەیەكیشە بۆ كۆمەڵگای مەدەنیو پرۆسەی بەدیموكراسی كردنی كۆمەڵ. هەوڵبدرێ ئیشوكارەكانی ئەو مەكتەبە بەتەواوی لە مەكتەبی رێكخستن جیابكرێتەوەو سەربەخۆ بێت بۆ ئەوەی ئیزدواجیەت لە كارەكاندا روونەدات.

## مەكتەبەكان:





مەكتەبەكان هەریەكەی هەلومەرجێك هێناویەتە دی، هەریەكەیان لە پرۆسەی كاری سیاسیو كامڵكردنی كۆمەڵو ئاراستەكردنیدا رۆڵی خۆیان دیوە. بەڵام مەكتەبی كۆمەلایەتی ئەگەر لەمەوپێش ئەو رۆڵەی بووبێ ئێستا كە ئێمە بەرەو بە یاساییكردنی سیستەمی ئیداریو سەرجەم ژیان هەنگاو دەنێینو دروشمی (یاسا سەروەرە) كە یەكێكە لە بنچینەكانی پرەنسیپی دیموكراسی بەرزكراوەتەوە، ئەوا مەكتەبی كۆمەلایەتیو لیژنەكانی رێڕەوی كێشەكان بە لایەكی تردا دەبات، نەریت جێگەی یاسا دەگرێتەوەو كێشەكان بە نیوە ناچڵی بەجێ دێڵێت كە لەو سەرەوە ئاڵۆزتر دێنەوە بەردەمی دادگا.

## هێزی پێشمەرگە:

لەمێژووی پڕ كارەساتو شەڕو شۆڕی یەكێتیدا، هێزی پێشمەرگە گرنگترین رۆڵو زۆرترین سەروەری تۆماركردووە، هەر هێزی پێشمەرگەشە مایەی مانەوەو بەرەوپێش چونی یەكێتیو خەونی دۆستو ئەندامەكانی. بۆیە كۆنگرە دەبێ لەسەری رابوەستێو لێی بپێچێتەوەو شێوازی گونجاو بۆ بەهێزكردنو تۆكمەكردنی بدۆزێتەوە بە شێوەیەك لە ئاستی ئامانجو خەونەكانی یەكێتیو گەلەكەمان دابێ. كورد دوای سەدەیەك فرمێسكو خوێنو ماڵوێرانی ئێستا تامی ئازادی دەچێژێو حكومەتێكی خۆماڵی پێكهێناوە، دوژمنان كە بەرژەوەندیان ناخوازێ، هەروا بە ئاسانی دەست لە شەڕو گێچەڵ هەڵگرن، بۆ رووبەرووبوونەوەشیان هێزی پێشمەرگە دڵسۆزانە لەمەیدان دایە، بەڵام بۆ ئەوەی لەهەر شەڕو گێچەڵێكدا سەركەوتووبینو بە كەمترین زیانیش شەڕەكە ببەینەوە، پێویستە هێزی پێشمەرگە تۆكمەتر، بە ئەزموونتر پەروەردەتر بكەین، بەهێزی بكەین بە باشترین چەكو تفاقی

جەنگیو باشترین فەرماندە، تایبەت شەڕی تەقلیدی نەماوەو ئێستاش شەڕو كەرەستەكانی شەڕ لەگەڵ پێشكەوتنی زانستو تەكنەلۆژیادا گۆڕاونو پێشكەوتوون، سەرختستنی هێزی پێشمەرگە یان هەرهێزو لایەنێك بە كەرەستەو شێوازی كۆنی شەڕ ستەمە هەر ئازایەتیو دڵسۆزیو ڕەوایی دەستەبەری سەركەوتن لەشەڕدا ناكەن! مێژوو شاهیدی دەیان شۆڕشی ڕەوای گەلانن كە لە هەمبەر هێزی تۆكمەو مۆدێرن دا شكستیان خواردوە! بۆ ئەوەی هێزەكانمان بە باشترین شێوە ڕێكبخرێن پێویستە شێوازی گونجاو بدۆزرێتەوە بۆ تۆكمەكردنیان..

١. پەروەردەی بەردەوام لیاقەتی پێشمەرگە بەرز دەكاتەوەو توانای شەڕكردن زیاد دەكات جگە لەوەی دەروازەیەكیشە بۆ وەرگۆڕانی هێزی نیمچە سەربازی بۆ هێزی سەربازی پەروەردەكراو.

٢. چەكو تەقەمەنی نوێو مۆدێرن.

٣. فەرماندەو ڕاهێنانی فەرماندەو ڕۆشنبیركردنی بە زانستی سەربازیو دیاری كردنی كەسی شیاو چونكە فەرماندەیی هەر وەك لێكۆڵەرە سەربازیەكان پەسندی دەكەن (ئەو هونەرەیە كە كۆنترۆڵی ڕەفتاری كەسانی تر دەكاتو وەگەڕیان دەخات بەو شێوەی كە خۆی دەیەوێ بۆ بەدیهێنانی ئامانجێكی دیاری كراو)[٤] كەواتە فەرماندە بەوە سەركەوتو دەبێ كە كەسانی بەردەستی بە باشترین شێوە بەكاربێنێ دیارە كەسێكیش دەبێتە فەرماندە كە مێژوویەكی باشو ڕەفتارێكی جوانو لیاقەو ئاستی وشیاری بەرز بێ.

---

[٤] عقيد سامؤئيل هنير ومقدم وليم توماس، تولى القيادة، مؤسسة العربية للدراسات والنشر، لاپەرە ١٨، چاپی دووەم ١٩٨٤ بغداد.

# حزبوڕێکخستن*

## لە نێو گۆڕانکارییەکانی سەردەمدا

فاکتەرو پاڵنەرە سەرەکی یەکانی هەر حزب[1] و ڕێکخراوێکی سیاسی خۆی لە ئامانجە ئابووری وسیاسی یەکاندا دەبینێتەوەو حزب دەبێتە ئەو ئامرازەی کە بۆ گەیشتن بەو ئامانجانە دەخرێتە گەڕ، هەنگاوی یەکەمیش بۆ ماڵی کردنی سەرجەم مەرامەکان گرتنە دەستی دەسەڵاتە.. حزبە سۆسیال دیموکراتەکان هەر لەسەرەتاوە لەسەر شێوازی خەباتو حکومەت و دەسەڵات ململانێی توندیان تێکەوت (فریدینالد لاسال ـ ١٩٢٥ ـ١٨٦٤ز، ئیدوارد برینشتاین ـ ١٩٨٥٠ـ ١٩٣٢ز کاوتسکی ١٩٨٥٤ـ ١٩٣٨ ز) [2] سێ ڕابەری چالاك و شارەزای بزوتنەوەی سۆشیال دیموکراتەکان بوون کە لەسەر شێوازی خەبات و شۆڕش و توندو تیژی یان ریفۆڕم و خەباتی پەرلەمانی لەگەل حزبە

* ڕێبازی نویٚ ژ٢٥ئاداری ٢٠٠٢





مارکسی یەکان لێك جیابونەوە کاوتسکی کتێبێکی لەسەر دکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا نوسی کە(لینین) بە رەخنەیەکی توند وەڵامی دایەوەو ئەو سێ رابەرە پێیان لەسەر خەباتی سیاسیو پەرلەمانی دادەگرت و شێوازی شۆڕش و توندوتیژیان رەت دەکردەوەودکتاتۆریەتیان بەمەترسی دەزانی و هاوکاری چین و توێژە نەدارەکانیان لەگەڵ کرێکاران بەپێویست دەزانی، باوەڕیان وابوو کە:

١ـ دەکرێ دەوڵەت بێ لایەن بێو نەبێتە ئامرازی چەوسانەوەی چینایەتی .

٢ـ شۆڕش و خەباتی چینایەتی ئالوگۆڕی کۆمەڵایەتی ناخولقێنن، بەڵکو شت دەگۆڕێ بەپێی پرۆسەی مێژوویی . گۆڕانی ژێرخانی کۆمەڵایەتی وا لە تێکڕای خەڵك دەکات سیستمە کۆمەڵایەتی و رژێمەکەیان لەگەڵ بارو دۆخی نوێ بگۆڕن.

٣ـ سۆشیالیزم دەبێ توندوتۆڵ بە دێموکراسیەوە گرێ بدرێو بە پێچەوانەوە ناوەڕۆکە مرۆڤ پەروەریەکەی لە دەست دەدات .

ئەو بیرو رایانە بوونە هۆی جیابونەوەی حزبە مارکسی یە شۆڕشگێرەکان کە لینین گەورەترین تیئۆریسێنی ئەو حزبانە بوو کە لە روسیا بە بەلشەفیەکان ناسران و دواتر حزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتییان دروست کرد. گۆڕانکاریە مێژووییە سیاسی یەکان لەسەر ئەرزی واقع ڕاستیو دروستی بەرنامەی سۆشیال دیموکراتیەکانیان سەلماندو لەکۆتایی هەشتاکانداو دوای حەفتا ساڵ ئەزمونی (م.ل) شۆڕشگێڕەکان لەیەکێتی شۆرەویو ئەوروپای رۆژهەڵات دارِمانو بەپەلە ئەو گەلو وولاتانە، حزبە شۆڕشگێڕو تۆتالیتارەکانیان هەڵوەشاندەوەو بەرەو ڕێکخستنی کراوەو دیموکراتو خەباتی سیاسیو پەرلەمانی بایاندایەوە. کاوتسکی دەیگوت: کرێکاران و زەحمەتکێشانو

هەژاران زۆربەی دانیشتوانی هەر وڵاتێك پێك دەهێنن، کەواتە بۆچی پەنا بۆ دیکتاتۆریەت ببەین؟ دکتاتۆریەت دیموکراسی پێشێل دەکات‌و پێویستی بەهێزی سەربازی‌و کۆنترۆڵی دام‌و دەزگا ئابووری وسیاسی‌و ڕۆشنبیریەکان هەیەو ئەوەش سیتەمی بەڕێوەبردن لە داد پەروەری‌و مافی مرۆڤ بەتاڵ دەکاتەوە!

گۆڕانکاری لەبیرو فەلسەفەی ئەو حزب و ڕێکخراوانەدا بەپێ‌ی گۆرانکاریە زانستی‌وسیاسی‌و کەلتوری و ئابوریەکان بەردەوامە، حزبە سۆسیال دیموکراتەکانیش نەپێك دەچن نە هەمووشیان چەپ‌و سۆشیالیستن وەکو ناویان وایە بۆنمونە حزبی کرێکارانی بەریتانیا، نەمسا، دانیمارك‌و سۆسیالیستی فەرەنسی، حزبی سۆسیالیست نین. سەرجەم ئەو حزبانە لەبەرنامەو دروشم‌و پراکتیکدا جیاوازی گەورەیان هەیەو (حزبی سۆسیالیست‌و دیمۆکرات) یش هەر لەنێو بیرو فەلسەفەی سۆسیالیست‌و چەپەکاندا هاتە کایەوەو لەچەند خاڵێکی بنەڕەتیدا ئەو حزبانە لە سۆشیال دیمۆکراتەکان جیا دەبنەوەو ئەوان پێ لەسەر سۆسیالیزم دادەگرن. گرکێ ٣دەڵێ: (بەبڕوای من سۆشیالیزم لە جیهاندا دەتوانێ وەکو ئەڵتەرناتیڤێك لەبەرامبەر سەرمایەداری حاکمدا گەڵاڵە بێت، بەڵام دەبێ ئەو سۆسیالیزمە بەپلەی یەکەم بتوانرێ هەڵبژێردرێ ئەم جیاوازیانەی لە کۆمەڵگادا هەن‌و کەلتورە جۆربەجۆرەکانی کۆمەڵگاکان لە بەر چاو بگیرێت و لە پەیوەندیەکی نێونەتەوەییدا بێت.) دیموکراسی فۆرمێکی حکومەت کردنەو بۆ خۆدورگرتن لە دیکتاتۆریەت هاتۆتەدی‌و بەبێ سۆسیالیزم داپەروەری بە کاڵای کۆمەڵگا نابڕێ‌و کەلێنی تۆقێنەری نێوان سەرمایەدارو هەژاران کەمناکرێتەوە، ڕۆحی مرۆڤ پەروەرانە ناکاتە ئامانجی





پرۆژەو گەڵاڵەکانی دەسەڵات، بۆیە سۆشیالیزم ئەو ئامانجەیە کەبیری ڕەحنە گرانە دەزێنێە هەموو پرۆژەو بەرنامەیەکی حزبەکەو بەوەی هەیە ڕازی نابێ‌و هەمیشە بەرەو ئایندەو کۆمەڵگایەکی تەندروست‌و دادوەرانەی پێشکەوتوتر دەڕوانی‌و خەباتی بۆ دەکات.لە حزبی سۆسیالیست دیموکراتدا کۆمەڵگایەکی سۆسیالیستی دیموکراتێك دەکاتە پێناوی خەبات‌و هەنگاوەکانی و(مەبەست لە سۆسیالیزمی دیموکراتیك کۆمەڵگایەکە کە تیایدا عەدالەتی کۆمەڵایەتی سەقامیگیرە، لەهەمان کاتدا ئازادی یە مرۆیی یەکان مسۆگەر کراون و تیایدا سیتەمی فرەحزبی دەور دەبینێ‌و مافە مرۆیی یەکان ڕەچاو دەکرێن ، کۆمەڵگایەك  کە تیایدا چەند لایەنی کۆمەڵایەتی بوونی هەیە ،بەڵام هاوکات دەوڵەمەندان کەمتر دەوڵەمەند دەبن،دەبێ دەست کورتان کەڵك و گەشەی کۆمەڵایەتی بیانگرێتەوە) ٤ دوای ئەو هەموو گۆڕانکاریانە لە نەوەدەکاندا ڕێگای سێهەم دێتە پێش (لە کاتێکدا مرۆڤایەتی ئەزمونێکی تاڵی بەجێهشتووە لەگەڵ ڕژێمە سۆسیالیستە دۆگماکان کە لە پێناو دادگەریدا قوربانیان بەئازادی داو لەگەڵ ڕژێمی سەرمایەداری کە لە پێناو ئازادیدا قوربانیان بە دادگەری دا. ڕێگای سێهەم دەیەوێ وەڵامێکی جیاواز بەکێشەی دیموکراسی بداتەوە. دەکرێ بڵێین ئامانجە گشتی یەکانی ریگای سێیەم لەبواری دیموکراتی یەتدا لەخولقاندنی ئامرازی نوێ بۆ حوکمرانیەتی چالاك، ڕێکخستنەوەی پەیوەندی یەکانی نێوان دەوڵەت‌و بازاڕو هاووڵاتیان، دۆزینەوەی بواری نوێ ، لەو نێوەندە داپێداگرتن لەسەر بایەخی خولقاندنی دامەزراوەی یارمەتیدەر بۆ قوڵکردنەوەی دیموکراتیەت و دامەزراندنەوەی کۆمەڵگای مەدەنی)٥

(ڕێگای سێهەم كە لە بەخۆدا چونەوەی حزبی كرێكارانی بەریتانیا بەهۆی تۆنی بلێر ڕوویدا بریتی بوو لە ژیانەوەی بیری حزب‌و باشتر كارلێك كردن لەگەڵ گۆڕانكاریە جیهانی یەكان‌و بارو زرووفی بەریتانیاو بەو شێوەیە حزبی كرێكارانی نوێ لەسەر بنچینەی بیردۆزەی ڕێگای سێهەم هاتەدی كە بووە هۆی كەوتنی پارێزگاران‌و سەركەوتنی حزبی كرێكاران ، كلنتۆن زیاتر لە بیست ساڵ‌و پێش هاتنە سەر دەسەلاَت بزوتنەوەیەكی نوێی لەحزبەكەیدا پێك هێنا بەناوی (دیموكراتە نوێییەكان)و بەرنامەیەكی ئابووری سیاسی نوێی ڕێكخست كە چەپگەراییەكی توندی تێدابوو چونكە ئامانجی گۆڕینی بارودۆخی كۆمەڵایەتی‌و ئابوری و تەندروستی هەژاران و بێبەشان‌و پەراوێزانی كۆمەڵ‌و ئەندامانی كەمایەتیە چەوساوەكان‌و ئەو، ئەو بەرنامەیەی پوختە كردەوە بەهاوكاری توندی نێوان زانایانی سیاسی لەلایەك‌و سیاسیە پیشەكارەكان لەلایەكی دیكەوە.) ٦

## بیرو ڕێكخستن

هەموو ئەو گۆڕانكاریانەی باسمان كردن لە بیرو ڕوانگەی فەلسەفی حزبەكاندا هاتوون وكە بەهۆیانەوە شێوازی كاركردن‌و ڕوانینیان بۆ هاوكێشە سیاسی‌وكۆمەڵایەتی‌وئابووریەكان گۆڕاوەوئەوگۆڕانكاریانەش بەرئەنجامی حەتمی گۆڕانكاریەكانی نێو واقعی كۆمەڵایەتین لێرەپرسیارێك خۆی دەسەپێنێ: ئەگەر لە وولاَتە پێشكەوتوەكانی جیهاندا بەبەردەوامی و لەگەڵ مێژووی گۆڕانكاریەكاندا بیرو بەرنامەی حزبیان گۆڕیبێ‌و بەپێ ی ئەو گۆڕینەش ئەرك‌و ئامانجی نوێتریان دیاری كردبێ لە كاتێكدا لەوێ پرانسیپەكانی دیموكراسی‌و كۆمەڵگای كراوە لەناخی خەڵكیدا ڕۆچوون‌و





قۆناغێكی باشیان لەچنینەوەی بەری ڕەنجی نێكۆشانی سیاسیان بڕیوە، ئاڵۆ گۆڕی دەساڵاتیش هەم مەترسی بۆ سەرسەروەری وڵاتەكەیان نەبێ‌و هەم گەمەیەكی سادەی ڕۆژژمێری تەمەنیان بێ، ئایا لە وڵاتی ئێمەدا كە هێشتا حكومەتێكی سەقامگیرو سەربەخۆیی یەكی ئابوری سیاسی دانپێدانراومان نی یەو كۆمەڵگاكەمان نامۆیە بەدیموكراسی‌و مەدەنیەت‌و دەیان گرفتی بیروڕای كۆنینەو هەڕەشەی داگیركەران،لە مشتوماڵ كردنەوەی بیرو فەلسەفەی حزبەكانماندا چ بەرنامەو پێوەرێك بكەینە دەستەبەری سەرخستنی حزب‌و ئەركەكانی ئایندە؟.

## بیری سۆسیالیست‌و دیموكرات

یەكێتی هەرلەسەرەتای دروست بوونیەوە مەیلی چەپی تێدا زاڵ بووە، كۆمەڵەو بزوتنەوە كەدوو ڕێكخراوی سەرەكی یەكێتی بوون، دوو ڕێكخستنی چەپی سۆسیالیستی بوون دواتر لە هەردوو كۆنگرەی یەكەم‌و دووەمدا گۆڕانكاری ڕێبازی فكری ئەوە دەردەخات كە یەكێتی گۆڕانكاریە جیهانی‌و ناوچەییەكان بەهەند هەڵدەگرێ‌و دەیەوێ بەپێ‌ی دراوە سیاسی، كۆمەڵایەتی، ئابوری، كلتوریە تازەكان هەنگاو هەڵێنێ‌و ڕێبازی فكری خۆی بینا بكات. سۆسیالیستی دێموكرات بەپێ لەسەر سۆسیالیزم داگرتن ناوەرۆكێكی جولاَوو ئامانجدار بەبەردیموكراسی بونەكەی دادەكات‌و كۆمەڵگایەكی

سۆسیالیستی دەبێتە درێژبووەوەی كۆمەڵگا دیموكراسیی یەكەو هەر بە سیتەمێكی دیموكراسی رازی نابێ كە رەنگە دادگەری نەگەیشتبێتە ئاستێكی باڵا تیایدا و مافی مرۆڤ و جیاوازی چینەكان بمێنێ، بۆیە سۆشیالیزم ئەو كۆمەڵگایە دەبێت كە بازاڕ تیایدا هەڕەمەكیو تەنها ملكەچی یاسا سەرمایەداریەكان نابێو بەڵكو بیرێكی مرۆیانەی ئامانجدار ئاراستەكانی بازاڕ ڕەنگ رێژ دەكاو دادگەری و بەها مرۆیی یەكان دەكاتە پێوانەی سیتمی سیاسیو ڕێگر لەبەردەم دەوڵەمەند بوونی نامەسئولانەو هەژار بوونی نامرۆڤانە.

## ڕێكخستن

ڕێخكستن رەگەكانی هەر حزبێك و بڕبڕەپشتی راوەستاوی و مانەوەیەتی، بۆیە بایەخدان بەڕێكخستن بایەخدانە بەحزبو ئایندەی حزبو حزبیش لەكۆمەڵگای ئێمەدابەهۆی نەخوێندەواری و دواكەوتوویی كۆمەڵگاكەمانەوە، بێ مافی نەتەوەیی و ژێردەستەیی نیشتمانی، ئەركەكان گرانترو هەمەلایەنەتر دەبن جگە لە خەباتی نەتەوەیی و رزگاری نیشتمانی، حزب دەبێ ئامرازێكی كاریگەربێ بۆ هۆشیار كردنەوەی كۆمەڵ و ئاشنا كردنی بە پرەنسیپەكانی دیموكراسی و مافە مەدەنی یەكانو ئازادی یە سیاسیەكان بۆ تاكو كۆمەڵگا بۆ ئەوەی وشیارانە تر ئەركە نیشتمانیو نەتەوەییەكانی راپەڕێنێ و بە





وشیاریەوە هەڵسوكەوت لەگەڵ چەمكە سیاسیو مەدەنی و حكومەتی یەكاندا بكات، كاریگەری لەسەر بریاری سیاسی هەبێ و یاساو دەستورەكانی وڵات بناسێ ویبانپارێزێ. بەو پێیەش بیری یەكێتی، بیری سۆسیالست و دیموكراتی پێویستە گەشەی زیاتر بە دیموكراتیەت بدات چ لەنێوخۆیدا و چ لەدەرەوە دا بۆ ئەوەی ببێتە نەریت و كەلتورێكی چەسپاوو جارێكی تر پرەنسیپە دیموكراتی یەكان لەنێو جەماوەرەوە بەسەر حزبو دەسەڵاتدا بسەپێنرێتەوە، تا وای لێ دێت جەماوەر دەبێتە پارێزەری راستەقینەی پرەنسیبو بەهاكانی دیوكراسیو سوسیالیزمەكەشی دەبێتە گیانێكی رەخنە گرانەو گۆڕینی كۆمەڵگای دیموكراسی بەرەو كۆمەڵێكی پڕ دادو پێشكەوتوو. حزبێكی ئاواش پێویستی بەرێكخستنێكی نوێ و گونجاوی وا هەیە كە ئەندامانی وشیارو ئەركەكانیان بەباشی راپەڕێنن. دۆخێكی ئاواش پوختە كردنەوەی ڕێكخستن و تۆكمە بونەوەی دەكاتە زەرورەتێك بە شێوەیەك كە خەسڵەتەكانی حزبێكی وشیارو مۆدێرنی تێدا نمایان بێ.

## بەنوخبە كردنی حزب

تێڕوانینێكی سەرپێیانە لە رێكخستنەكانمان بە داخەوە دوركەوتنەوە یەكمان بەرەچاو دەخات لە پرەنسپەكانی رێكخستن و حزبایەتی تەنانەت لە مێژووی یەكێتیشدا دیارە، ئەوەش لەلایەك بەرئەنجامی ئەو گۆڕانكاریە سیاسی و ئابووریو كۆمەڵایەتی و رۆشنبیرانەیە كە بە سەرتەواوی دونیادا هاتوونو كۆمەڵو حزبەكانی كوردستانیش لێی بێبەری نین . لەلایەكی تر هەندێك گرفت و كەمایەسی نێوخۆ لەوانە:

١. شل بونەوەی شانە بەندی و كاڵبوتەوەی ئیلتیزامی ئەندامان.

٢. زۆری و بۆری كە لە چۆنایەتیەكی باش كەمدەكاتەوە.

٣.درێژی ریزەكانی هەیكەلی رێكخستن ( شانە ، پۆل، كەرت ، كۆمیتەمەڵبەند، مەكتەبی رێكخستن ) كە ئەوەش بیرۆكراسیەت دەخولقێنێ و رۆحی هەڤاڵانە، كز دەكاو لێپرسراو زۆر دەبێ و ئەندامی سادە بۆ پەیوەندی كردن بە لێپرسراو ماندوو دەكات . جگە لە نەبوونی كادری وشیار كە ئەو لێپرسراویەتیانە پڕ بكاتەوە ناچار دەبن كەسانی نەشیاو ئەولێپرسراوێتیانە وەرگرن. بۆیە ڕەنگە باشتر بێ پۆل هەڵگیری و تێوانی جەماوەری رێكخستن و لێپرسراوەكان كەم بێتەوە. بەگشتی دەتوانم بڵێم ئەوەندەی لە رێكخستندا جەماوەری رێكخستن هەیە هێندە رێكخستنی بەكردەوە نی یە كە بەپێی پەیڕەوی ناوخۆكار بكات و ئامانجەكانی خۆی ئاوێتەی ئامانجەكانی حزب بكاتو بەرژەوەندی حزب و نەتەوە بخاتە سەرووی بەرژەوەندیە كەسی یەكانی خۆی، بۆیە گەڕانەوە بۆ حزبێكی نوخبە واتە ئەوانەی بەكردەوە و بە خواستی سیاسی نەك خواستی تر دێنە ریزی رێكخستنەوە بەبەردەوامی پەیوەندیان بەئۆرگانەكانی رێكخستنەوە دەبێ وخەم خولیایان یەكالای خەم و خولیاكانی حزب دەكەن چالاكانە ئەركەكاتیان رادەپەڕێنن مافەكانیان دەناسن و ئەوانە رێكبخرێن و شانە بەندی بكرێن، باقی جەماوەرە كە بكرێت بەلایەنگرو شێوازێكی تری پەیوەندی پێوەكردنیان هەبێ، چونكە بەحزبی كردنی كۆمەڵگا نەك كارێكی پڕ مەترسی یە بەڵكو حزبەكە خۆشی دەبێتە دەستگەمەی ناپرەنسیبی وبێ سەرو بەرەیی و هەرەج مەرەجی و بەرەو لێك





بڵاوبوون دەچێ. لە كاتێكدا حزبی بەپرەنسیب دەتوانێ جەماوەرێكی زۆر لەدەوری دروشمەكانی كۆكاتەوە پێشرەوایەتی زۆربەی زۆری خەڵكەكە بكات.

## گرفتەكان

ئەو گۆڕانكاریانەی بەسەر دونیادا هاتوون مرۆڤی سەردەمیان والێكردووە زیاتر پێ لەسەر ئازادیە كەسی یەكانی خۆی داگرێ و ئامانجەكانی خۆی پەرە پێ بدات و بەو دانوسانەدا بچێتەوە كە لە نێوان مرۆڤ وەكو تاكێك لەگەڵ حزبێكی سیاسیدا دەیكات كە لە بەرامبەر ئەو پەیوەندیە ناچارە ئازادیەكانی خۆی سنوردار بكات و واز لەكۆمەڵێك ئامانجی كەسی خۆی بهێنێ، یا لانی كەم بیكاتە بەشێكی بچوكتر لە ئامانجە گشتی یەكانی حزب و گرێیان بدات بە ئامانجەكانی حزبەوە، ئەم دۆخە لە وڵاتە ئەوروپی یەكاندا هێندە زەق بۆتەوە كە تەنانەت ئەندامان لە هەڵبژاردنەكانیشدا بە كەمی ئامادەدەبن كە زۆر چارەنووس سازیشن. ئەم دۆخە كۆمەڵی ئێمەشی گرتۆتەوە تایبەت لەدوای دەركەوتنی بەجیهانیبوون و گۆڕانی هەلومەرجە ناوچەیی یە كەی ئێمەش لەدۆخی ئۆپۆزسیۆن و شۆڕشەوە بۆ دۆخی حكومەت و نیمچە سەقامگیری سیاسی وایكردووە هەلومەرجی رێكخستن و كاری سیاسیش بگۆڕێ و توندو تۆڵی رێكخراوەیی و دیسپلینی حزبی كاڵ ببنەوە، تەنانەت لە كاركردن بەپێی پەیڕەوو بڕیارەكانی حزب كارشكێنی سەر هەڵبداو بەرژەوندیە كەسیەكان زەق ببنەوەو فەردیەت و دەستەگەری لەپێناو ئەو بەرژەوندیە كەسیانەدا بۆتە دیاردەیەكی زاڵ جگە لە كۆمەڵێك گرفتی تر كە ڕەنگە تایبەت بن بەكۆمەڵگای ئێمە لەوانە:

١-نەخوێنــدەواری و نزمــی ئاســتی وشــیاری سیاســی و تایبــەت لەمــەڕ دیموکراسی.

٢-لاوازی شارە زایی لەبیری سۆسیالیستی ودیموکراتدا لەنێو هەڤاڵاندا .

٣-کەمی کادری شارەزا لەبواری بیرو فەلسەفەی حزبی و کاری ڕێکخراوەیی دا.

٤-دەستەگەری و ناوچەگەری و خزم خزمێنە .

٥-نەبوونی کەلتوری دیموکراسی و سەیرکردنی وەکو تاکتیك .

٦-لاوازی کارکردنی بەکۆمەڵ و دەسـەلاتی بەکۆمـەڵ و زاڵـی فەردیـەت و میزاجی شە خصی .

٧-دیاردەی دڵ رازی کردن لەسەر حسابی ئەرکە حزبـی یـەکان و بەرنامـەی حزبی .

٨-نەبوونی هیچ ئیمتیازێك بۆ ئاستی وشیاری کادران و جیـاوازی نـەکردن لەگەڵ کەسانی ناووشیار .

٩-قوڵ تەبوونەوەی بیرو وشیاری نەتەوەیی و نیشتمانی .

١٠. بیرۆکراسیەت وگیانی بورژوازیانە لای هەندێ لە لێپرسـراوان و لاوازی گیانی بەرپرسیارێتی لە کاری حزبیدا.

١١. جیـاوازی لـە بـژێوی کادران،کـەمی بـژێوی کـادرانی ڕێکخـستن کـە وادەکات کادر بەشێك لەکات و خەمی خۆی بۆ ژیان تەرخان بکات .





## پێشنیار

بـۆ چارەسـەرکردن‌و هـەموار کردنـی گرفتـەکان‌و خولقانـدنی دۆخێکـی سایکۆلۆژی گونجاوو دیموکراسیانە بۆ کاری ڕێکخراوەیی ئـەو پێـشنیارانە بـە پەسەند دەزانین:

- گەشەو گرنگی دان بە بەشی وشیاری و ڕووناکبیی ر و مەکتەبی بیرو وشیاری بۆ ئەوەی :

١-بەبەردەوامی و لەئاستی جیاجیادا دەورەی کادیران بکەنـەوە تایبـەت بـۆ قوڵکردنـەوەی گیـانی نەتـەوە پـەروەری و نیـشتمانی و بـیرو فەلـسە فـەی سۆسیالیست و دیموکرات و ئاشناکردنیان بـە دیـالۆگ و ململانـێ کـە لـەنێو

مەکتەبە فکریە جۆر بەجۆرەکاندا دێنە ئاراو سیماو دەرئەنجامەکانی جیهانگیری .

٢-بەهەند هەڵگرتنی ئاستی هۆشیاری کادیران و بەئیمتیاز دانانی پلەی وشیاری و خوێندەواری لەبواری دامەزراندن و یارمەتیدا بۆ ئەوەی ببێتە هاندەرێك بۆ خۆ پەروەردە کردنی ئەندامان.

٣-دەورەی تایبەت بەژنان بەشێوەیەك گونجاو بێ لەگەڵ هەلو مەرجی ژیانی ژناندا وەکو کردنەوەی دەورەی کادران تایبەت بەژنان لە سنوری مەڵبەندەکاندا.

* باشتر کردنی ژیانی کادیرانی موتەفەریغ و هەژمارکردنی پلەی ڕێکخراوەیی سالآنی خەبات، باری کۆمەڵایەتی وپلەی خوێندەواری لەبواری موچەدا .

* گەڕانەوە بۆ پەیڕەوی ناو خۆو پێشێل نەکردنی بۆ هیچ مەبەستێك.

* دۆزینەوەی ڕەگەکان و فاکتەرەکانی تەکەتول و دەستەگەری و بنبڕ و وشك کردنیان و زەمینە خۆش کردن بۆ ململانی ی فکری .

* بەهێزکردنی ئۆرگانەکانی ڕێکخستن لەرێگەی :

١. دانانی کادیری وشیارو بەتواناو بەئەزموون بۆ بەڕێوەبردنی ئۆرگانەکان ودەسەڵات پێدانیان لە بواری خۆیاندا بەپێ ی پەیڕەو.

٢. پرس وڕاپێکردن بەئۆرگانەکانی ڕێکخستن لەلایەن دەزگا ئیداریەکانەوە لەمەڕ دانان و ئالوگۆڕی لێپرسراوە ئیداریەکان لە سنورەکەی خۆیاندا .

٣. چەسپاندنی داوەری لەنێوان هەڤاڵاندا لەئەرك و مافدا .

٤. بەگەڕ خستنەوەی پرەنسیپی رەخنەو رەخنە لەخۆگرتن.





٥. بەهێزکردنی پرەنسیپی سزاو پاداشت بەرامبەر بەکارەکان.

٦. بەهێزکردنی بەشی چاودێری و هەڵسەنگاندنو کردنی بەدەزگایەکی سەربەخۆ کەئەندامێکی (م.س) سەرپەرشتی بکات بەدەسەڵاتی تەواوە بۆ بەدوادا چوون و چارەسەرکردنی گرفتەکانی ڕێکخستن لەسەرجەم ئاستەکاندا بەخێرایی و لەکاتی خۆیدا.

* قوڵ کردنەوەی گیاتی نەتە وەیی و نیشتمان پەروەرەی وەکو بەشێکی بنچینەیی لە بیری حزبداو یەکالاکردنەوەی لەگەڵ بیری شوسیالیست و دیمۆکراتداو بۆ ئەوەی ببێتە نەریتێکی چەسپاو لەهۆشی سەرجەم ئەندامانـدا دوورلە باوەڕی دۆگمانەو بەبیرێکی کراوەو زیندوو و بە کەڵك وەرگرتن لەسەرجەم روانگە فەلسەفی و فکریە جیاجیاکانی کەلتوری جیهانی .

## سەرچاوەو پەراوێز:


١-حسین جەمیل / دروست بوونی حزبە سیاسیەکان – چاپخانەی سەفوەت ، ساڵی ١٩٩٧ – سلێمانی

٢-د. حەمید عەزیز / فەلسەفەی سۆشیال دیموکرات – مەکتەبی ڕێکخستن، بەشی روناکبیری – سلێمانی ١٩٩٩

٣-گۆڤاری ڕێبازی نوێ ژمارە (٢٣) چاوپێکەوتن لەگەڵ گرکێ – ئەیلولی (٢٠٠١)، لاپەڕە (٤٦)

٤-سەرچاوەی پێشوو.

٥-المنهج/ عدد (١٧) شتاء (١٩٩٩) العولمة الطريق الثالث — السيدياسين — ص٨٣.

٦-سەرچاوەی پێشوو ، لاپەرە (٧٨)

٧-بۆ دەست نیشانكردنی هەندێك لەگرفت و چارەسەرەكانی رێكخستن بڕوانە راپۆرتی سكرتێری گشتی یەكێتی نیشمانی كوردستان بۆ كۆنگرەی دووەم .

# ناکارابوون.. زەمینەیەک بۆ گەندەڵی*

زۆر لەزاناکان، ناکارابوون‌و گەندەڵی پێکەوە گرێ دەدەن‌و بەتەواوکەری یەکتریان دەزانن، ناکارابوون زەمینە بۆ گەندەڵی خۆش دەکات.

لەلایەکی ترەوە لاوازی‌و ناکارایی بەڕێوبەران‌و بەرپرسان دەبێتە هۆی بڵاوبوونەوەی نایاسایی، یاسا ناتوانێ ڕۆڵی خۆی ببینێ چەندەش یاسا ناکارابوو هێندەش گەندەڵی پەرە دەستێنێ، بەڕێوەبەران‌و چاودێرانی دارایی لەودۆخەدا لەوە لاوازترن بتوانن یاسا جێبەجێبکەن، ئەوەش بۆخۆی دەرفەتێکی باشتر بۆ کاربەدەستە گەندەڵەکان دەڕەخسێنێ بۆئەوەی دەزگاکانی

* ڕۆژنامەی چاودێر ژ ٧١ ڕێکەوتی ٢٠٠٦/٤/٣





ئیدارەو چاودێری بنکۆڵ بکەن‌و درێژە بەکارە نایاساییەکانی خۆیان بدەن، لەودۆخەدا کاتێ خەڵك بەرپرسان دەبینن کاری نایاسایی دەکەن‌و دەسەڵاتی یاساش لاوازە بەرانبەریان‌و لێپرسینەوەیان لەگەڵدا ناکرێ ئیدی گەندەڵی بەشێوەیەکی بەربڵاو تر پەرەدەسێنێ.

یاساکان، شێوازەکان، تێگەیشتنەکان‌و سیستەمی چاودێری‌و کۆنترۆڵ‌و هەروەها سیستەمی سزادان سەبارەت بەگەندەڵی لەوڵاتانی جیهانی یەکەمدا ئاشکرایەو هیچ بەربەستێك لەوبوارەدا نابینرێت، ئەمە لەکاتێکدایە کەلەوڵاتانی جیهانی سێهەمدا هەموو شتێك لەبازنەی شك‌و دوودڵی دایە، ژیان لەپەراوێزی ئاسایش‌و لەناوچەی خۆڵەمێشیداو دیوان سالاری ئیداری لەوڵاتانی جیهانی سێهەم دایە، ئەم هەل‌و مەرجە، کەش‌و هەوای باش بۆکاری نهێنی گەندەڵ کاران پێك دێنێت.

لێکۆڵەران باس لەوەدەکەن کاتێ دەوڵەتی لاواز سەرچاوەی داهاتەکانی دەرەکی‌و سەرچاوەی ژێر زەمینی بوو، خەڵك گرنگی بەبەشداری سیاسی نادات لەونێوەندەدا کەسانی هەلپەرستی سیاسی دەردەکەون‌و کۆنترۆڵی دەسەڵات دەکەن. بەڵام ئەگەر داهاتی دەوڵەت بنچینەکەی لەسەر باج بێ تاکەکانی کۆمەڵگا زیاتر گرنگی بەدەستەڵات‌و کاروبارەکان دەدەن، چونکە دەبێتە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆو ڕۆژانە لەگەڵ دەستەڵات داو دەستەڵات ڕاستەوخۆ لەگەڵ ژیان‌و کاری خەڵك بەشێوەیەکی جدی تر بەرەو ڕوودەبێت، بەهەمان ئەندازەش تاکەکانی کۆمەڵگا زیاتر گرنگی بەدەستەڵات دەدەن‌و چاودێری دەکەن‌و باشتر نارەزایەتیان دەجولێ بەپێچەوانەی دەستەڵاتێك داهاتی زۆرو زەبەندی دەست بکەوێ، لەدەرەوە یان لەکانزا ژێرزەمینییەکان‌و فەرمانبەران

بەوپارەیەوە بەخۆوە گرێبداتو هیچ باجێكی واش نەخرێتە سەرشانی خەڵك هەست بە دەستەڵاتو كەمو كوڕییەكانی بكەنو هانیان بدەن لەباجو پیتاكەكانیان بپرسنەوە، كاتێ خزمەتگوزاری وەكو پێویست نەبێت یان هەست بەدزیو گەندەڵی بكەنو لەو بارانەدا كەلێیان وەردەگیرێ، هەرئەوەش دەبێتە كۆڵەكەیەكی سیستەمی دیموكراسی كە دروستكردنی كۆمەڵێكی ووشیارو بەرپرسیارە واتە لێرەدا هاووڵاتی ووشیار لەدایك دەبێ كە ئێمە هێشتا زۆر لێی دوورین. كەچی دەبینین ئێمە هەر گلەیی دەكەینو ڕەخنە دەگرین ئەمەش جگە لەشان خاڵیكردن لەلێپرسراوێتی، ئەوە چ مانایەك دەدات بەدەستەوە جگە لەناكارابوون لەحكومەتو حزب دا، جێبەجێ نەكردنی لێپرسراوێتی بریتی یە لەناكارابوونو ئیدارەی پاسیف كە لێكۆڵەرەوەكان لەئەوجۆرە ناكارابوونەدا ڕایەڵەی پەیوەست بە گەندەڵی دەبیننەوەو پێیان وایە پەیوەندییەكی توندوتۆڵ لەنێوان گەندەڵیو ناكارابوون دا هەیە!

لێكۆڵینەوەیەك لەسەر ١٥٠ لێپرسراوی پلەبەرزی دەوڵەتیو نوێنەرانی كۆمەڵگای مەدەنی لەووڵاتانی جیهانی سێهەم دا ئەنجام درا دەری خست كەئەوان پێیان وایە، گەندەڵی دارایی لەبەشی دەوڵەتیو كێشەو گرفتی بنەڕەتیو دەزگا دەوڵەتییەكانی پاسیڤو ناكارا كۆسپی سەرەكی سەر ڕێگای پێشكەوتن بەئەژماردێن.

(لیفەر ماك) لەلێكۆڵینەوەیەكی دا دەریخست كەدامەزراوە مەدەنییە لاوازەكان، پەیوەندییەكی زۆریان لەگەڵ ڕادەی پەرەسەندنی گەندەڵی دارایی داهەیە ئەگەر گەندەڵی لەهێزێكی دەوڵەتدا وەك كەمو كوڕی ئیداری پێناسە بكرێت لەووڵاتانی جیهانی سێهەم دا گەندەڵی سیاسیو ئیداری بەشێكە





لەپێكهاتەی دەوڵەت هنگلتۆن دەڵێ: لەزۆربەی سیستەمە سیاسییەكان دا گەندەڵی سیاسیو ئیداری لەخوارەوە دا تەشەنە دەكات لەو ووڵاتەدا.

ئەوەش لەكاتێك دا دەبێ كەچاودێری (ڕەقابە) لاوازدەبێو پەرلەمانیش كەبەرزترین دەستەڵاتی یاساییە بەئەركەكانی خۆی هەڵناسێ لەچاودێریو بەدواداچوونو ڕێكخستنی مادده یاساییەكانی تایبەت بەخەرجو داهاتو لێپێچانەوەو پاشان پرەنسیپی سزاو پاداشت پشتگوێ دەخرێ. لەلایەكی تریش دادگاكان ناتوانن ڕۆڵی خۆیان لەبواری لێپرسینەوەو ڕاكێشانی گەندەڵكاران بۆبەردەم یاسا ببینن.

## پێوەرە جیهانیەكان

گەندەڵی لەهەموو ووڵاتان بڵاوبۆتەوەو بووە بەدیاردە، لەو ووڵاتانەی سەدان ساڵە دەوڵەتن.لەم سۆنگەیەوە ڕێكخراوی نێونەتەوەیی شەفافیەت بەمەبەستی روو بەڕوو بوونەوە لەگەڵ گەندەڵیدا دامەزرا ئەم ڕێكخراوە هەردوو ساڵ جارێك كۆنفرانسێك دەبەستێ لەژێر ناوی كۆنفرانسی نیونەتەوەیی روو بەڕووبوونەوە لەگەڵ گەندەڵیدا. لەساڵی ١٩٨١بە بەشداری٣٠نوێنەری ووڵاتانی جۆراو جۆر لەوڵاتی چیك بەڕێوەچوو. ساڵی ١٩٩٥ بۆیەكەمین جار دیاردكانی گەندەڵی بڵاوكردەوە، ئەم ڕێكخراوە دیاردەی

گەندەڵی وەك دیاردەدەیەکی تری ئابوری دەست نیشان کردو ناساندی.(دیاردەی گەنـدەڵی) لەئاسـتی گەنـدەڵی لەسـفرەوە تـا ١٠نیـشاندەدات بـەم پێیـە سـفر زۆرترین گەندەڵی و ١٠کەمترین گەنـدەڵی دەردەخـات. وەك نمونـە سـاڵی٢٠٠١ فنلانـد بەرێـژەی٩/٩ کـەمترین ئاسـتی گەنـدەڵیو بـەنگلادش بەرێـژەی٤/ زۆرترین گەندەڵی نیشاندا.

کەواتە بـوونی گەنـدەڵی لـەنێو کۆمـەڵگاو دامـەزراوە ئیداریـەکانی ئێمە لەهەر دوو ئیدارەکە شتێکی نامۆو سەرسوڕمێن نیـیە بـەڵام شـاردنەوەو هەوڵنەدان بۆچارەسەرکردنی سەیرو سەمەرەیە، تاڕادەیـەك لەئیـدارەو چ لـەنێو حیزب دائێمە وەکـو(ی. ن. ك) لێپرسـراوان ئازایانـە پـەردەیان لەسـەر لاداوەو نەك نەشاردراوەتەوە بـەڵکو دەیـان پـڕۆژەی جـۆر بـەجۆریش پێـشکەش کـراون، بەڵام ئەوەی جێگەی نیگەرانیە سستیەك لەهەوڵو چـالاکیەکان دا دەبینـرێ بـۆ ڕێوشـوین دانـان بـۆ چارەسـەرو سـنوردانان. هـەر ئەوەشـە دەکـرێ وەك پێـشتر ئامـاژەم پێـدا بـەناکارایی نـاوزەد بکـرێ کـە تەمـەنی گەنـدەڵیو نایاسـایی لەهێندێك بواردا درێژ دەکاتەوە، زۆربەی وڵاتانی کە گەندەڵی یـان تیـدا زۆرە پلانی جۆراو جۆریان داناوە بۆ نمونە:

نایجیریا: کە لەڕیزی پشەوەی ئەو وڵاتانە دایـە کـە گەنـدەڵیان زۆرە هـەوڵی داوە یارمـەتی لەکەسـانی شـارەزای وڵاتـانی تـر وەربگـرێو هـەروەها ئـەو هەنگاوانە بهاوێ بۆ تەخت کردنی ڕێگریەکان:

١ـ بەهیزکردنی لیژنە فەرمیەکان دژبە گەندەڵی بەمەبەستی کۆنترۆڵکردنی ئەو دیاردەیە.





٢ـ جێ بـەجێ کردنـی سـتراتیژێکی میللـی گـشتگیر بـۆ خـاوێنی و پـاکی سیستەمی ئیداری.

داڕشـتنی سیـستەمێکی بـەهێز بـۆ چـاودێری لەسـەر خـەرجی پرۆژەکـان بەتاییەت ئاوەدانکردنەوە کە کۆمـەڵگای مـەدەنیو سیستەمـی وەرگرتنی پارەی، لەئاستێکی فـراوان دا، لـەخۆگرتبێ. کـۆی ئـەم کارانـەش لەڕێگـەی(سـەرانەی دەوڵەتی)و بەڕێژەی ١ ـ ٣ ٪ ی ئەو پارانەی لـەو لێپرسـراوانە دەگەڕێتـەوە کـە دزیەکانیان سەلێنراوەو ئەو یارمـەتیانەی لەدەرەوە پێشکەش بەدەوڵەت دەکـرێن جێ بەجێ دەبێ. هەمـوو ئەو کارانەش بە لیژنەیەکی خاوەن دەسەڵات سپێرراون کە بۆ ئەم کارانە دامـەزراوە بە نـاوی(مـافی حـوکمرانی) کـە سـەبەرخۆیەو بـۆ ڕێگری لەچالاکیە گەندەلێیەکان تازە دامـەزراوە.

ئێران: کە ئەویش لەو وڵاتانەیە کە ڕێژەیەکی باش گەنـدەڵی تیدایـە بۆ ڕوو بەڕوو بوونەوە لەگەڵ گەندەلێدا لەژێر چاودێری جێگری یەکەمی سەرۆك کۆمـار کۆمیتەیەك پێك هێنراوە لەژێرناوی کۆمیتەی بەرەوپێشبردنی پاکسازی سیستەمی ئیداری کە ئەرکەکانی بریتین لە:

* کـۆنترۆڵ و کـە مکردنـەوەی گەنـدەڵی و پـاك و سـاغلەم کردنـی کـۆی دەزگاکان بەهۆی ڕێنمـاییو هانـدانی ئـەو دەزگایانـە بەمەبەسـتی ڕێکخستنو جێبەجێ کردنی ریـساو سیاسـەتو بەرنامـە دژەگەندەلێـەکانزیاتر ناسـاندنیو وەرگرتنی متمانەو پشتگیری گشتی بۆ بەرنامـەکانی دژ بەگەندەڵی.

بـــرەودانو ڕێکخـــستنی بیرۆکـــەو کـــاری ڕێگـــری کـــردن لەگەنـــدەڵیو بەگژاچوونەوەی بەهۆی ئەو بەرپرسو کارمـەندانەوە کە لەئاستی بەرپرسیایەتیو پاکسازی دەزگاکاندان.

ئامانجی ئەو کۆمیتەیەش بریتین لە:

١ـ بالاّ دەستکردنی یاسا.

٢ـ وەلاّمدانەوە بەخواستە خزمەتگوزاریەکانی دەزگاکان بەبێ جیاوازی.

٣ـ بەیاسایی کردنی ژمێریاری بەڕێوەبەریەکان.

٤ـ زۆر کردنی سودو دەسکەوت.

٥ـ روونکردنەوەی یاساو رێساکان‌و پرۆسەی کار کردنی بەشی خزمەتگوزاری.

٦ـ پێکهینان‌و بەهێزکردنی توانای ئیداری‌و جەماوەری بۆ رێگری لەسەر هەلّدانی گەندەلّی.

٧ـ ناساندن‌و کاری یاسایی بەهاوکاری دەزگاکانی دادەوەری لەبەرانبەر ئەو کەسانەی تووشی گەندەلّی دەبن.

سیاسەتی کۆمیتەکەش بەردەوام بوو لەسەر شەفافیەت‌و دەستڕاگەیشتنی خەلّك بەزانیاریەکان دەربارەی چالاکیە ئابووریەکان، کڕین‌و فرۆش‌و گرێبەستەکان‌و بەهێزکردنی سیستەمی چاودێری دارایی‌و دادگاکان‌و ناساندنی گەندەلّیەکان‌و لکۆلّینەوەی بەردەوام لە هۆکاروفاکتەرەکانی ئەم دیاردەیە.

ئەگەر لەو ولاّتانەدا کە مێژوویەکی دوورو درێژی حوکمرانی‌و کاروباری ئیداری‌و دەیان دەزگاو دامەزراوەی چاودێری و کەلتوری جۆر بەجۆری خاوەن ئەزمونیان هەیە گەندەلّی هەبێ و کردبیانە خەم‌و خولیاو چارەسەریان کردبێتە ئەرك‌و پێداچوونەوەو دروستکردنی دەزگاو کۆمیتەی تایبەت بەدەسەلاّتی تەواوە وە، بۆ ئێمە زۆر ئاسانترە چونکە لەوێ ئەوانەی





بەگەندەلّی‌و کرداری بۆ رۆکراتیك دەقیان کردووەو هێزێکی ماددی‌و سیاسسیشیان لەپشت خۆیانەوە دیوە بەلاّم ئەوە لەئیداراتی ئێمە دا:

دیاردەی گەندەلّی لەسەر ئاستی تاکە کەسیەو هیچ حزب‌و سەرکردەیەکی ئیداری‌و حزبیم نەدیوە پشتگیری لە دزی‌و بەرتیل‌و کەمتەرخەمی‌و ناکارایی هیچ بەرپرسێکی حزبی یان حکومی بکات تەنانەت بەدزیەوەش کاری وا بلاّونەبۆتەوە یان هیچ نەبێ من نەمبیستووە ئەگەر هەشبێ زۆرکەم‌و تاك‌و تەرایەو هەموان لەسەر چارەسەری ئەم دیاردەیە هاوڕان‌و خۆشبەختانە بەقسەو بەنوسین دژایەتیان کردووە، پاشان دام‌و دەزگاکانی تازەن‌و هەموو ١٠ــ١٢ سالّێکەو ئەویش لەدۆخێکی ناجێگری سیاسی‌و ناسروشتی دا پێگەییوەو بەعسی‌و ئیدارە گەندەلّەکەش کارێگەری‌و خوی خراپی ئیداری بەجێ هێشتوەو دەکرێ بەگژی دا بچینەوەو سیستەمێکی کاراترو بەهێز بە دەزگاو کەسی شارەزا موتوربە بکەین‌و بۆ ئەو مەبەستەش دەبێ:

١ـ چاوبەسەرجەم کادرە ئیداریەکاندا بخشێنینەوە بێ ئەوەی بژێوی هیچکەس ببڕدرێ بەپێی پسپۆڕی لەجێگەی تایبەت بەخۆیان دابنرینەوە.

٢ـ چەند کۆمیتەیەکی بەهێزو سەربەخۆ پێکهێنرێ بەدەسەلاّتی تەواوەو دوای دەورەی تایبەت لەسەر ئیشکردن لەسەر چاودێری ئیداری‌و دارایی رابهێنرین‌و دابمەزرین.(دەکرێ ئەوکۆمیتانە سەربەپەرلەمان یان سەربە سەرۆك‌و جێگری حکومەت بن)

٣ـ بودجەیەکی سەربە خۆی هەبێت.

پاشان ئەم دامو دەزگایانەی ئێمە کە دەقیان بە کەلتوری بەڕێوەبردنی کۆن. کرتووە پێویستە بەنەریتو بەڕێوەبردنی نوێ و سەردەم بگۆڕدرین.

لەوولاتە پێشکەوتووەکانیش بەردەوام بەپێی پێشکەوتنو ئالۆو گۆڕەکانی دونیا ئیدارەش میکانزمو جۆری بەڕێوەبردنەکانی دەکۆڕرێ ئەگەر وانەبێ تووشی داخورانو کەم تەرخەمیو پاشان گەندەڵی دەبن بۆیە پێویستە:

١ـــ سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی پەیکەری حکوومەت(الهیكل التنظيمی)بکرێ.

٢ـ پەرەپێدانی یاساو ڕێنمایی یەکان.

٣ـ کەمکردنەوەی ڕۆتینو بیرۆکراسی.

٤ـ بەرزکردنەوەی ئاستو توانای بەڕێوەبردنو بلاوکردنەوەی هۆشیاری کارگێری.

دیارە دەبێ هەرلەسەرەتاشەوە گرنگیەکی زۆر بدرێ لەدیاری کردنی دەزگاکانو دروستکرنیان بەپێی زەرورەتی پێداویستیو خزمەتکوزاریەکان پاشان دەستنیشان کردنی فەرمانبەرانو لێپرسراوانی دەزگاکان بەپێی ئەو پێوەرانەی بۆ ئەو مەبەستە دەردەچێو پاشان کارکردنی دەزگاکە بەپێی ئەو مافو ئەرکانەی لەلائحە یاساییەکان دا دێتو ئازادی تەواویان دەبێ لەوچوار چێوەیەدا.

لەوانەش هەموو گرنگتر چالاکردنی پەرلەمانە وەکو بەرزترین دەسەلاتی یاسادانانو هەموار کردنی یاساکانو چاودێری ڕێکوپێکی دەزگائیداریو دارایی یەکان، ئەو بۆشایی یەی تاکو ئێستا پەرلەمان دروستی کردووە بەهیچ دەسەلاتو لایەنێکی پڕنەکراوە تەوەو گومانیشم هەیە حزب یان





بەتەنها حکومەتو دەزگا چاودێری یەکەی بتوانن بەو ئەرکانە هەستن بەڵکو پێویستە:

١ـ حزبو ڕێکخستنەوەکان ڕۆڵی چاودێری خۆیان ببینن بەلام بێ ئەوەی ڕاستەو خۆبێنە ناوکایەکەوە بەڵکو ڕاپۆرتو تیبینی و ڕەخنەکانی خۆیان پیویستە بدەن بەحکومەت(ئەنجومەنی وەزیران) یان دەزگا تایبەتیەکانی چاودێریو ڕێگری لەگەندەڵی(ئەگەر هەبن).

٢ـ پەرلەمان ڕۆڵی سەرەکی خۆی ببینێ هەر لەدەرکردنی یاسای نوێ بۆ ڕێگری لە گەندەڵیو بیرۆکراسی هەم هەموار کردنی یاساکان بەپێی هەلو مەرجەکانو هەم ناردنی لیژنەی تایبەت بۆ چاودێری دامو دەزگاکان بە بەردەوامی. هەروەها ڕێکخستنی داهاتو سەرفیاتی دامو دەزگاکان بەپێی یاسایەکی ڕوونو ئاشکرا.

٣ـ حکومەت(ئەنجومەنی وەزیران) خۆشی دەزگای چاودێری دارایی چالاکتر بکاو بە ئەندامی شارەزاو دەست پاکو سەربەخۆ پڕیکاتەوەو دەسەلاتی تەواو بودجەی سەربەخۆیان هەبێ.

٤ـ دادگاکان چالاك بکرێنو دادوەری مێژووپاكو شارەزا تەحدید بکرێن کە بەئەرکی خۆیان هەڵسن بە بەدواداچونو یەکلاکردنەوەی کێشە ئیداریەکان بەپێی یاساتایبەتیەکانی ئیدارە یاخود دادگا ئیداریەکان دابنرێنو تایبەت بن بەکێشە ئیداریەکان وەکو ئەو دەوڵەتانەی کار بە دادگای دوولایەن(المحكمة المزدوجة) دەکەنو دادگای تایبەت بەئیدارەیان هەیەو یاسای ئیداری کارپێ دەکەن.. دیارە عیراق ئەو مەبدەئەی وەرگرتووەو کاری پێ دەکات بەلام دادگای سەربەخۆی بۆ پێك نەهێناوە.

نادڵسۆزو ناكارایی پەرە بەگەندەڵی دەدات ئەویش بەدەوری خۆی مۆراڵ گومڕا دەكات لێرەوە ویژدان ئازار ناچێژێ بەرانبەر بەدزیو بەفیڕۆ دانی سامانی گشتی ئەوەش خاڵێكی گەلێك خەتەروبڤەیە ئەگەر لەووڵاتێك دا سەرهەڵبدا وەك رۆسۆ دەڵێ:(لەراستیدا چاودێری بۆ رێگرتن لە گەندەڵبوونی راكان پارێزگاری لەمۆڕاڵ دەكات. لەشوێنكی تردا دەڵێ: لەوانەیە چاودێری بۆ پارێزگاری كردن لەسەر مۆڕاڵ بەسوودبێ، بەڵام هەرگیز بە كەڵكی چاككردن نایەت، با چاودێرەكان ماوەیەك دەست كراوەو دامەزراوبن، دەبینین كە چۆن یاساكان لە لوتكەی چالاكیاندا دەبن، ئیتر هەرئەمەندە كە ئەم چالاكیە لە دەست چوو ئەوا ئیتر بێ هیوایی باڵ بەسەر هەموو شتێكدا دەكێشێت، چونكە كاتێ كە یاساكان هێزی خۆیان لەدەست دەدەن ئەوا ئیتر هەرشتێكی شەرعی هێزێكی بۆ نامێنێتەوە).

لێرەدا گرنگی یاساكانو كارپێ كردنیان بنچینەی چاودێریو پارێزگاری كردنە لەمۆراڵ(ئەخلاق) پێك دێنێ بۆ هەر دەزگایەكو هەر شێوازێك كار بكات بۆ چاكردنی ئیدارەو رێگری لە كەم تەرخەمی و گەندەڵی و بیرۆكراسی دەبێ پشت بەیاساو كاربە یاسا بكاو هیچی تر ... هەر خۆبەستنەوەیەك بەهەرشتێك جگە لەیاسا كۆمەڵ(حزب، عەشیرەت، گروپ) لەگەڵ دەسەڵاتی حكومەتو یاسا ئاڵو گۆڕ دەكاو فەوزای گشتی ووڵات دەتەنێتەوە.

سەرچاوەكان:

١-جان جاك ڕۆسۆ..گرێبەستی كۆمەڵایەتی.

٢-زندە باد فساد..علی رەبیعی.

# ئیرادەیەكی یەكگرتوو بۆ چاكسازی *

## چەندسەرنجێك لە پڕۆژەكان

دامەزراندنی دام‌و دەزگای حكومەت لەنێو كەلتورێكی بێ پێشینەی حوكمڕانی‌و بێ پێشینەی دیموكراسی لەهەرێمی كوردستان وناوچەكەداجگە لەودۆخە نائاساییەی كە گەلەكەمان پێیدا تێپەڕیوە، ئاسایی یە ناكارایی‌و فەردیەت سەر هەڵبداو بیگەیەنێتە گەندەڵی لەزۆر بواری سیاسی‌و ئیداریدا، ئەم دیاردەیەش هەر سنووری ئیدارەی سلێمانی‌و یەكێتی نیشتمانی نەگرتۆتەوە،هیچ وڵاتیك لەدونیادا نیە ئەندازەیەك گەندەڵی تیادانەبێ هەرچەند خاوەنی مێژووی درێژی حوكمڕانی وكەلتوری دێموكراسیش بێ! بەڵام سەركردایەتی‌و كادیرانی یەكێتی بەجورئەتەوە دانیان پێداناوەو بەگژی دا هاتونەوەو قۆڵی چاكسازیشیان لێ هەڵماڵیوە، سەبارەت بەوەش دەیان پڕۆژەو بابەتی جۆربەجۆر نەك هەر لەكەناڵە حزبییەكان بەڵكو یەكسەر بۆبەرچاوی

---

* ئاسۆ ژ ٢٢٩ یەكشەممە ٢٩/٥/٢٠٠٦





جەماوەرو لەڕۆژنامە ئەهلیەكاندا خراوەتە ڕوو، ئەوەش سەرەتایەكی دڵخۆشكەرە بۆ شەفافیەت‌و كۆتایی هێنان بە زەمەنی دیزە بەدەرخۆنەكردن‌و شاردنەوەی لەچاوی میدیاكان،دوایین پڕۆژەش پڕۆژەی ١٦ كەسیەكە و پڕۆژەی (م. س) ، پڕۆژەی كاك نوشیروان بوون.

حەزمكرد وەك كادرێكی لایەنگیری چاكسازی كەپێشتر چەند بابەتێكم لەسەر (بەڕێوەبەرەو كۆنگرە) ،(حزب لەنێو گۆڕانكاریەكانی سەردەمدا) ، (كولتور لەبەردەم گۆڕان دا) و (ناكارایی‌و گەندەڵی) بڵاوكردۆتەوە حەزدەكەم تێڕوانینی خۆم لەسەر ئەم پڕۆژانەش دەرببڕم:

### دەستپێكی گۆڕان‌و چاكسازی:

خاڵی دەستپێكی گۆڕان‌و چاكسازی لەئیرادەی ئەو كەس‌وگروپ وحزبەوە دەست پێ دەكات كە لێبڕاون، گۆڕان‌و چاكسازی دەست پێ بكەن، لێرەوە باوەڕبوون بەچاكسازی‌و تیژكردنەوەومشت ومالّی ئیرادەی تاكەكان‌و گردكردنەوەی لە كۆ ئیرادەدا لەهەر دەزگاو حزبێك خاڵی سەرەكی گۆڕانكارییە، چونكە ئیرادەو قەناعەت، پێكەوە گرێ دراون تاكو قەناعەت نەبێ ئیرادە ناكەوێتەوە گەڕ، دیارە بۆ هەموو هەڵس‌و كەوتێكیش ئیرادەیەك لەپشتیەوەیە كەمەبەست لێی ئامانجێكی دیاری كراوە. ئەو فاكتەرانەش كەلەپشت هەموو ئەو هەڵس‌و كەوت‌و بڕیارو بۆچونانەوەن زەرورەتە، زەرورەتیش بەرئەنجامی هەموو ئەو دۆخ‌و حاڵەتانەن كە ڕێڕەوی

بەرەوپێشچوونی حزب‌و کۆمەڵگای تووشی ئیفلیجی کردووەو بەزەرورەت لەخاڵی سەرەتای گۆڕانێکی حەتمیدا وەستاوە، ئەگەر بەئیرادەوە گۆڕانەکە نەبێ ئەوا یاساکانی سروشت خۆیان ئەو گۆڕانە دەکەن جیاوازییەکەش لەوەدایە گۆڕانێك ئیرادەی لەپشتەوەبێت بەبەرنامە دەبێ‌و کەمتروایە لەزەمینەی خەون‌و خولیاو مەبەستەکان دەربچێ بەپێچەوانەشەوە، گۆڕانکاری خۆبەخۆیی‌و سروشتی کەس نازانێ چ بەرەنجامێکی لێدەکەوێتەوە کورد گوتەنی دەکەوێتە بەر شەقی زەمانە. لەنێو (ی. ن. ك) سیمای ئیرادەیەکی دەستە جەمعی بەڕێوەیە ئەو ئیرادەیە هەرچەند لەبنکەی یەکێتی دا هەیەوسکرتێری گشتیش زیاتر لەدووساڵە هانی چاکسازی دەداو دەرگای گفت وگۆورەخنەی خستۆتە سەرگازی‌پشت، لەسەرکردایەتیش داهەروا، بەلاّم لەنێوکادیران دا پتر خۆی دەنوێنێ، بۆیەش پێویستە لەوگۆڕانکاری‌و چاکسازییەدا ڕۆڵی زیاتر بدرێ بەکادیرانی خوار سەرکردایەتی.چاکسازی وڕیفۆڕمیش پرۆسەیەکی هەمەلایەن وئالۆزە ودەستکاریەکی بوێرانەی کۆی بونیادوستراکتۆری حزب وسیستە می کارکردنی حکومەتە.

## دەسەلاّت‌و گۆڕان :

ڕۆسۆ وادەسەلاّت دەناسێنێ کەخووی تاك گەندەڵ دەکات، بۆیەدەبێ دەستەلاّت تەنها بۆگەل بێت مۆنتسکیوش سروشتی دەستەلاّت بەگەندەڵکار وەسف دەکات لەسەر حسابی ئازادی تاکەکان و دەڵێ: دەبێ‌هەرسێك دەستەلاّتەکە هێزێکی وایان هەبێ سنوور بۆ دەستەلاّتەکانی یەکتر دابنێن و لەشوێن خۆیان ڕایان بگرن، بۆیە هەر لەدوای ئەزموونی ئەڵخی دەستەلاّت لەمێژوودا بیرۆکەی لێك جیاکردنەوەی دەستەلاّتەکان هاتە کایەوە واتە





دەستەلاّتەکانی: (بەڕێوەبردن، یاسادان، دادوەری) دەبێ هەریەکەو تایبەتمەندی خۆیان هەبێ‌و ئەوەندە هێز یان دەستەلاّتیان هەبێ هیچیان نەتوانن سنووری دەسەلاّتەکانی یەکتر ببەزێنن. هەربۆیەش ئەو سیستەمە سیاسیەی پشت بەم لێکجیاکردنەوەی دەسەلاّتانە نەبەستێ خۆشی بێ‌و ترشی بێ بەرەو فەردیەت‌و دیکتاتۆریەت مل دەنێ.بۆیەچاوخشاندنەوە بە دەستەلاّتەکانیش دالەنێویەکێتی داگرینگی خۆی هەیە،بەشێوەیەك لە کەسێك ودەزگایەکدا کۆنەبێتەوە، وادەکات کاری بەکۆمەڵ و بەپلان جێگە بە کارکردن بە میزاجی شەخسی، لێژبکات لیرەوە یاساو پەیڕەوەکان باشتر ڕێزیان لێ دەگیرێ.

## یەکێتی‌و فکرو گۆڕان :

یەکێتی ڕێکخراوێکی سۆسیالیست‌و دیموکراتە کەوایە دەبێ ئەوە لەهەڵسوو کەوت‌و بڕیارەکانی دا ڕەنگ بداتەوە، دەبێ پێداگری بنیاتنانی سیستەم‌و کۆمەڵگایەکی دیموکرات بین، ئەوەش سەرەتا دەبێت لەنێو خودی خۆماندا لەسەرکردایەتی دا لەمەکتەب‌و ئۆرگانە حیزبی‌و ئیدارییەکاندا پەیڕەوی دیموکراسیەت بکرێ‌ولە وێوە شۆڕبێتەوەو وردە وردە ببێ بەکەلتور. بۆئەوەی ئەم قۆناعەتەش بچەسپێ پێویستە لێپرسینەوە هەبێ، دەزگایەك هەبێ چاودێری ئیش‌و کارەکان بکات‌و پێشێلکردنی بڕیارو پێڕەوی ناوخۆ بەکردەوە سزای بۆ دابنرێ‌و کاری پێ‌بکرێ، هێندەی پێشێلی پەیڕەوو بڕیارەکان زەمینەی گەندەڵیان ڕەخساندووە هێندە لەنەبوونی بڕیارو پەیڕەوی جوان‌و

چاكدا خۆی نابینێتەوە، ئەوەش لەنەبوونی فكرو فەلسەفەی حزبیەوەنیە، ڕەنگە وەكو پێویست پەروەردەی فكریو فەلسەفی نەبێ ، بەڵام فكرو فەلسەفەو جیهانبینی ئێمە ڕوونە، كە دیموكراسیەتەو هەموو ئەو یەكسانیو عەدالەتیە شە كە لەكەلتووری سۆشیالیزم دا هەیە دوور لەلایەنە دیكتاتۆریەتەكەی.

**سەرنج لە پرۆژەكان:**

حەزم دەكرد داڕێژەرانی هەرسێك پرۆژەكە پێكەوە پرۆژەیەكی تەواو چڕوپڕیان پێشكەش كردبا چونكە لێكجیابوونی پرۆژەكان هێندەی نیشانەی لێكجیاوازیە لەبیرو بۆچوون بۆ چاكسازی هێندە بۆچوونی ڕەنگاو ڕەنگ بۆ چاكسازی ناگەیەنێ، چونكە بۆچوونی جۆراو جۆرو هەمەڕەنگ ئەگەر لەشێوازدا جیابن لەئەنجامدا دەگەنەوە یەك، بەڵام ئەگەر هەر لەسەرەتای بۆچوون دا كەلێنیان تێ كەوت گرفت بۆیەكخستنەوەیان دێتە گۆڕێ، نەخوازەڵا ئەو بۆچوونانە لەسەركردایەتی دابن! چونكە وەك لەسەرەتا ئاماژەم پێدا گرنگترین شت بۆ چاكسازی یەكێتی ئیرادەیە، پێویستەو دەبێ ئەو هەڤاڵانە ئیرادەیان یەكخەن بۆچونەكانیان لێك نزیك بخەنەوەو یەكی خەن، ئینجا ئەوە باشترین زەمینە دەڕەخسێنێ بۆ هەنگاوەكانی تری چاكسازی چونكە چاكسازی بڕیارێكو هەنگاوێكو كارێكی دیاریكراوو ڕۆژانە نیە هێندەی پرۆسەیەكی ئاڵۆزو بەردەوامەو ئەوەش پێویستی بە قەناعەتو باوەڕێكی جێگرو بەردەوام دەبێ، ئەوەش هەرهێندەی باوەڕو بۆچوونی ئەم بەڕێزانە بكەوێتە گەڕ بەوحوكمەی ئیرادەیەكی گشتی كادیرانی لەپشتە زۆر





سەركەوتوانە دەچێتە پێش،وێنەی ئەوئیداو سومبولەش كەدەبێ چاوی لێبكرێ وولاتان وحزبە خاوەن مێژوو وكەلتورە دەوڵە مەندەكانی ئەوروپان.

**مەكتەبی دارایی ومەكتەبی چاودێری:**

كاك نوشیروان پێكهێنانی دوو دامەزراوە یان مەكتەبی پێشنیار كردووە كە دامەزراوەی دارایيو دامەزراوەی چاودێرین كە لەپرۆژەی (م. س)یەكێكیان و پرۆژەی ١٦ كەسیەكەشدا ئاماژەیان پێدراوە بەشێوازێكی تر، لەبەرئەوەی دوو دامەزراوەی زۆر گرنگنو ڕێكخستنو دامەزراندنی ئەم دامەزراوانە ڕۆڵێكی حەیاتیان دەبێ لەپرۆسەی چاكسازی دادەبێ بۆیە لێرەدا لەسەریان دەوەستم.

هەردەزگایەكی گشتی خۆی لەگەڵ دامەزراندنیدا بەپێی یاسا دەبێتە خاوەنی كەسایەتی مەعنەویو لەسەر ئەو پێودانگەش مامەڵەی لەگەڵ دا دەكرێو دەتوانێ بچێتە نێو گرێبەستەكانو پرۆژەی ئابوری جۆراوجۆری هەبێ،لێرەدامەكتەبی دارایی سەرمایەی بەردەستی نەك تەنها بۆ سەرفیات بەكاردێنێ بەڵكو قازانج بەدەست دەخا بەوەش باشتر خەرجیەكان دادەپۆشێ، ئەوە بەنسبەت دامەزراوەی دارایی، دامەزراوەی دووەم مەسەلەی چاودێری ئیداری و دارایی یە... لەهەموو دەوڵەتانی دوونیادا سیستەمی چاودێری گەوهەری ڕاوەستاویو بەڕێوەچوونی ئیدارەیە هەر سستیو كەم تەرخەمیەك لەم سیستەمەدا دەبێتە هۆی بەرەڵاییو بڵاوبوونەوەی كاری نایاساییو لەوێشەوە گەندەڵی بڵاودەبێتەوە لەم سیستەمەشدا چەند دەزگایەك ڕۆڵ دەبینێت:

١ـ پەرلەمان: كەهەم یاسا دادەنێ لەبواری ئیداریو داراییو لێپێچانەوە لەگەندەڵیو كەمو كوڕییەكانی هەم یاساكان بەپێی هەلو مەرج

هەمواردەکات، هەم لیژنەی هەمیشەییی و لیژنەی کاتی دەبێ بۆ بەدواداچوون و لێپرسینەوەو سەردانی ئیدارەو وەزارەتەکان و سەیرکردنی فایلەکان و سەرفیاتەکان،هەم پەرلەمان پرسیارو لێپێچانەوە لە حکومەت و وەزیرو بەڕێوەبەرەکان لە کاروباری ئیداری ودارایی دادەکات.

٢ـ دامەزراوەی چاودێری دارایی هەم لەحکومەت و هەم بۆ دەزگاکانی حزب بەدەسەڵاتی تەواو لەکەسانی نەزیهو سەربەخۆو شارەزا، ئەو ئەرکەشیان پێ بسپێررێ کە هەرسێك پرۆژەکە ئاماژەیان پێداوە لەلێپرسینەوە لەگەندەڵی و دەوڵەمەند بوونە بێ هۆو بێ سنورەکانی هێندێك کەس(کسب بدون سبب).

٣ـ دادگاکان: دەتوانن ڕۆڵێکی باش ببینن و دەستیان زیاتر بکرێتەوە بۆ ئەمەش (یاسای ئیداری) (Administration Law) پشتی پێ دەبەسترێ. کە هەموو ئەوکێشانە یەکلایی دەکاتەوە کە تەرەفێکیان ئیدارەی گشتی یە ئەوە هەموو دام و دەزگا حزبیەکانیش کەخاوەنی کەسایەتی مەعنەوین دەگرێتەوە، تاك لەکۆمەڵگای ڕێکخراودا فەزایەکی ئازادی هەیە کەیاسا دەیپارێزێ، بەڵام ناکرێ ئەم ئازادیە سنوری نەبێ بۆیە دەسەڵاتی گشتی کە لەیاسادا بەرجەستە دەبێ سنورەکانی دیاری دەکات لەچوارچێوەی ئەو دە ستەبەریانەدا کە لەیاسادا دەچەسپێنرێن، ئیدارەی گشتی ئەو ئەرکە دەگرێتە ئەستۆ بەشێوەیەك هەم ئازادیەکانی دەپارێزێ هەم ئاسایشی گشتی و بێ ئەوەی هیچ کێشەو گرفتێك بهێڵێ ڕووبدات ئەوەش لەڕێگەی (ضبط الأداری) یان ئەوەی کەبە (بولیس الأداری) لەزمانی فەرەنسی و لاتینی دا ناسراوە بە (La Police Administrative)جێبە جێ دە بێ لەبەرانبەر سەرجەم فەرمانبەراندا لەهەر پلەیەك دابن.





## ئەنجومەنی کادیران:

خاڵێکی تری گرنگ کەدەمەوێ لەسەری بوەستم کەهیچ یەك لەپرۆژەکان لایان لێ نەکردۆتەوە مەسەلەی بوونی ئەنجومەنێکە لەکادیران ئەمەش بەدوو فاکتەر بەپێویست دەزانم:

١ـ لەم قۆناغەدا کەچاکسازی بۆتە زەرورەتێکی بێ ئەملاو ئەولاو خۆلێ لادانی بەرەو ئایندەیەکی نادیارمان دەبا، لەونێوەندەدا کادیرانی خوار سەرکردایەتی ڕۆڵێکی بەرچاویان دیوە لەقسەکردن لەسەر گەندەڵی و کەم و کوڕیەکان و خستنەڕووی بیروبۆچوونی جۆراو جۆر بۆچارەسەرو چاکسازی، ڕەخنەو گلەیی بەردەوامیش لەسەر هەڵس وکەوتێك کە پێچەوانەی پەیڕەو یان لەگەڵ قازانجی گشتی یەکێتی و گەل نەهاتبێتەوە، بەداخەوە هەرچەند بەردەوامیش ئەو هەڵس و کەوتانە دووبارە دەبنەوە بۆیە بۆپێداگری لەو بۆچوونانەو بەکردەوە جێبەجێ کردنیان دیسان دووپاتی دەکەینەوە کە پێویستە ئیرادەی کادیر بخوێنرێتەوەو حسابی بۆبکرێ بۆئەوەی:

* زەمینەیەکی باشتر بڕەخسێنرێ بۆگەنجان بۆهاتنەناو ئۆرگانەکانی دەستەڵات.

* بۆ بوونی مینبەرێکی دەستەڵات بۆ قسەکردنی گەنج لەهەر بڕیارو پێشنیارێك دا.

٢ـ ئەو ئەنجوومەنە ئاسانکاری و بەرچاو ڕوونیەك دەبێ بۆ (م. س) بۆئەوەی وەك فیلتەرێك هەموو بڕیارێکی گرنگ دوای تەتەڵەکردنی بێنێتەوە بەردەستی (م. س) واتا ئەم ئەنجوومەنە پێش ئەوەی بڕیاری سیاسی لە (م. س) دروست

ببێ ئەو تەتەڵەی بیرۆکەکان دەکات بەپێی تایبەتمەندییەکانو ئینجا دێتەوە بەردەست (م. س) بۆ بڕیاری کۆتایی. بەنموونە پێشنیارکردنی پاڵێوراوانی کابینەی حکومەت دەبوایە لەئەنجومەنێکی ئاوادا تاوتوێ کرابان بەپێی پێوەرێکی سەردەمانە کەلانی کەمی ووشیاری سیاسیو دڵسۆزیو دەستپاکی پاڵێوراو لەبەرچاو بگرێ لەگەڵ مێژووی سەرکەوتنو شکستەکانی پاڵێوراوەکە، ئەمجار بخرێتە بەردەم بڕیاری کۆتایی (م. س).دوای ڕەزامەندی (م.س)بەدەنگی زۆرایەتی مولزەم دەبن.

**پێکهێنانیشی:**

١ـ ئەم ئەنجوومەنە لەژمارەیەك کادێر پێکدێت (٤٠-٦٠) کەس کە شارەزای جۆراو جۆریان دەبێ لە (سیاسەت، یاسا، ئابوری، ئیدارە... هتد)و دەبێ دەرچووی زانکۆ یان پەیمانگا کە مترنەبن ڕاوێژیان پێدەکرێو هەموو بڕیارێك لەوێوە دوای تاووتوێکردنی بۆ بڕیاری کۆتایی دێتەوە بەردەست (م. س).

٢ـ ئەم ئەنجومەنە لەسەر هەموو ڕووداوە گرنگەکانی دونیا فایلی تایبەتی دەبێو ڕاپۆرتی دەوری دەبێولەکاتی زەرورەت یان لەسەر داوای (م.س) ی بەڕێز دەینێررێ بۆ (م. س) و سەرکردایەتی.





٣ـ ئەم ئەنجومەنە لەپەیوەندییەکی توندو تۆڵدا دەبێ لەگەڵ مەکتەبەکانو مەڵبەندەکانی ڕێکخستنو حکومەت بۆقسەکردن لەسەر دیاردەو ڕووداوە سیاسیو ئیداریو داراییەکان.

٤ـ ڕێنمایی بۆ سەرجەم ئەو شوێنانە دەنێرێ بۆ ئاگاداربوونو بەدوادا چوون.

٥ـ میزانیەی خۆی دەبێ.

٦ـ ڕاستەوخۆ سەربە (م. س) ی بەڕێزیان سکرتێری گشتی دەبێ.

*بۆ ئێستا تاکو کۆنگرە دەگیرێ دەکرێ لەلایەن (م. س) وە ئەو کادیرانە دیاری بکرێن. دواتر لەلایەن کۆنگرەوە هەڵئەبژێررێن.

پێموایە هەموو چاکسازی ئێمە گرێ دراوە بەوەی کە: تاچەند ئەو کۆئیرادەیی یە دێتەبوونو دەکەوێتە گەڕ، پاشان تاچەند دەتوانین لەسەر ئەو دووخاڵە ڕابوەستین کەئاماژەم پێدان، واتە سیستەمی چاودێریو ڕەقابە کە گەوهەری بە مؤسسات کردنی ئیدارەیە، پاشان وجودی ئەنجومەنێکی شارەزا لەکادیران بۆ پاڵپشتو هاوکاری (م. س) ی بەڕێزو سەرکردایەتی لەلایەكو دەرگایەك بۆ بیروبۆچونی تازەو کەسانی گەنج کەباشترین زەمینەی وەرگۆڕانو پێشکەوتنی (ی. ن. ك)ە کە دەبێتە داینەمۆی گۆڕانی کۆمەڵگاش لەلایەکیتر.

**مەکتەبەکان:**

پڕۆژەکەی (م. س) هەرچەند فراوانتر چوّتە سەر ڕێکخستنەوەو چارەسازییەکان، بەڵام دەربارەی مەکتەبەکان جگە لەچەند بیروڕایەکی گشتی

گـۆڕانێكی ڕیـشەیی نـویێ پێـشنیار نـەكردووە كەلەگـەڵ دەرهاویـشتەكانی ئیمڕۆی دونیادا بێتەوە لە پڕۆژەكەی كاك نوشیروانیش دا زۆربـەی مـەكتەبـەكان هەڵئەوەشـێنێتەوە،بەلاّم ووردەكاریـەكانی دەرنەخـستووە،لەو چـاوپێكەوتنەدا كەچـاودێرلەژمارە٧٤ ڕۆژی٥\٢٥ لەگـەڵی كـردووە باشـتر مەبەسـت وبەڵگـەی پێشنیارەكانی ڕوونكردۆتەوە.دوای تێڕامـان گەیشتمە ئەو بڕوایـەی دەكـرێ ئـەم دووپڕۆژەیــــە زۆرتــــر تــــاووتوێبكرین وبەڕاوســــەرنجی ڕەخنەگرانــــە دەوڵەمەندبكرێن،بۆئەوەی بینەبەرنامـەی ڕێگـای چاكسازی.چونكە چاكـسازی دەستكاری كردنی كۆی بونیادوستراكتۆری حزب وحكومـەتە.

مـن لـەدوو بابـەتی جیـادا لەسـاڵی ٢٠٠٠ بابـەتێك بـەناوی بـەڕێوە بـەرەو گـۆنگرە، كـە لـەڕێبازی نـوێ ژمــارە ٢١ دا بلاّوكراوەتــەوەو ســاڵی ٢٠٠٢ لەبابـەتێك بـەناوی حـزبو ڕێكخـستن لـەنێو گۆڕانكارییـەكانی سـەردەم دا، بەدرێـژی ڕای خـۆم لەسـەر ڕێكخـستنوهێندێك لـە مـەكتەبـەكان نوسـیوە، كـە كورتیەكەی لێرەدا ئاماژە پێ دەدەم: بەنسبەت ڕێكخستن پێم وایە میكانیزمی ڕێكخستن بەپێی گۆڕانكارییەكانی دونیا كەبەسەر كۆمـەڵگاو مرۆڤ وەكو تاك دا هاتووە، دەبێ بگۆڕدرێ، ئەو هەیكەلی شانەیەندیە دوورو درێژە كەئەنـدامی سادەی لەسەركردایەتی زۆر دورخستۆتەوە باشترە نەمێنێ، پاشان ئەو پلەبەندیە تەقلیدیە ڕۆحـی داهێنـان ولێپرسـراویتی دەكوژێ،لـەحزبی مۆدێرنـدا هـەموو كادیرێك لێپرسراوە،ئەوهەموپلەبەندیەو گوێڕایەڵیە وئەمرونەهیـەی سـەردەمی حزبی ستالینیە بەسەرچووەو جگەلـەكادیری دەسـتەمۆوكۆیلە چـی تـر بەرهـەم ناهێنێ.دواترریكخستنی پۆلاّیین جەماوەرت لێ دوور دەخاتەوە،ڕێكخستن دەبێ بۆململانێ ی هەڵبژاردنەكان ئامادە بكرێ، باشترە ڕێكخستن بكرێتـە نوخبـەو





ئەوانەی سیاسەت دەكەن سـەرقاڵی كـاری ڕێكخـستن بـنو سـەرجەم ڕێكخـستن كەلەبنەڕەت ڕا جەماوەری ڕێكخـستنن بمێنێتـەوەو لەبۆنـەو هەڵبژاردنـەكان دا كۆبونەوەی فراوانیان لەگەڵدا بكرێو پێویست ناكات لیستەبەندیو شانەبەندی كـە جگـە لـەوەهمێك شـتێكی تـر نیـە بكرێـت، مانـدوكردنێكی بـێ هـودەی كادیران وجەماوەر زیاتر شـتێكی تـر نیـە! چونكە ئەوانـە دۆسـتو هـەواداری یەكێتین بەلاّم ڕێكخستن نین بەمانای ووشە، كە پێشم وایە مـەكتەبی ڕێكخـستن پێویستە بۆ سەرپەرشـتی كردنـی سـەرجەم ڕێكخـستنەكانو حەڵقەیـەكی پێـك گەیشتە لەنێوان ڕێكخـستنو (م. س) دا وەك پـڕۆژەی (م س) ئامـاژەی پێـداوە دەبێ بەهێزبكرێ بەكادیری ووشیارو بەئەزمون.

## مەكتەبی بیرو هۆشیاری**

مـەكتەبێكی ئاوا پێویـستە بـەهێزبكرێ لـەڕووی كـادیری نـەوعیو لـەڕووی بودجەوەو ئەركەكانی فراوان بكرێت، لـەولاّتان دەیـان مـەكتـەبو دەزگـا هەیـە ڕۆڵی ڕاوێژكاریو كاری لێكۆڵینەوە دەكاتو پەیوەندی تونـدوتۆڵی بەسـەرۆكو سەركردەكانەوە هەیە، دەبوایە مـەكتـەبی بـیر دەزگایـەك بـا وەك سەرچـاوەیەكی

** سەرەڕای ئەوئیمكانیتە كەمەی لەبـەر دەسـتی دایـە كەكـەمترە لەئیمكانیـەتی ریكخراویكـی بـچوكی كۆمـەلاّیتی،سـەدان كتێـب ونامیلكـەی بەچـاپ گەیانـدوەوكۆنفرانس ودەیـان كۆبوونـەوەی دەربارەی چاكسازی ودەیان كۆڕو ووۆرك شۆپی لەسەر بابەتی هەمـەجۆر گرێداوە.

زانیاریو سیاسیو فکریو دەیان فایلو لێکۆڵینەوەی هەمە جۆری هەبوایە کە سەرکردایەتیو دامو دەزگا حزبیو ئیدارییەکان کەڵکیان لێوەرگرتبا هەر دەربارەی ئەم چاکسازیە دەبوو مەکتەبی بیرو هۆشیاری یەکەمین پڕۆژەو دەیان دانیشتن بۆ گفتو گۆو دەیان سیمیناری لەوبارەوە ڕێکخستبا بەڵام بەداخەوە ئەو مەکتەبە بەشێوەیەکی سروشتی لەدایك نەبوو بەڵگەش ئەو پشتگوێ خستنە پرۆکێنەرەیە لەلایەن سەرکردایەتیو لێپرسراوانەوە کە لەهەموو ڕووەکانەوە بەڕێوە دەچێ، ئەو مەکتەبە ناوێکی گەورەی لێنراوە بەڵام گرنگیەکی کەمی پێدراوە.

## مەکتەبی ڕاگەیاندن:

دەبێ بەهێزبکرێو زیاتر بکرێتەوە، خۆبەستنەوەی بەچوارچێوەیەکەوە گیانی داهێنانو ڕۆڵی کاریگەرانەی لەپێشخستنی حزبو کۆمەڵگادا دەکوژێ، دەبێ میکانیزمی ترو میتۆدی تر بگرێتەبەر، بەڵام وەك مینبەرێکیش بۆ حزب کەڵکی لێوەربگرێو ڕۆژنامەی تریشمان هەیە کەوەك کۆمپانیاو دامەزراوەی سەربەخۆ کاردەکەن بۆیە پێم وایە لەم قۆناغەدا ڕاگەیاندن هێشتا ئەرکی حزبی لەسەرشان ماوە بەڵام بەو پێودانگانەی کە لە دونتای مۆدێرن دابەڕێوە دەچێ،دەبێ خەسڵەتەکانی راگەیاندنێکی سەردەم لە:قوولی،شەفافیەت،راسنگۆیی،جورئەت،دەست پێشخەری...لەخۆی دا کۆکاتەوە.





## مەکتەبی ڕێکخراوەکان:

وێڕای ڕۆڵێکی گەشو بەرچاو لەچەند ساڵی ڕابردوودا لەمەڕ گۆڕانی مەدەنیو هۆشیارکردنەوەی پیشەییو ڕێکخراوەیی،کاتی ئەوە هاتووە لەمەودوا میتۆدی کارکردنی خۆیان بگۆڕن جگە لەهاوکارو پاڵپشت بۆ سەرجەم ڕێکخراوو سەندیکاکان هیچ لێپرسراوێتیەکی تر وەئەستۆ نەگرێو ڕۆڵی تەنسیقکردن زیاتر نەبینێ چونکە تەواوی ڕێکخراوو سەندیکاکان لەڕووی (ڕێکخراوەیی، پیشەیی وئابوری)سەربەخۆنەبن مەحاڵە چاوە نواڕێ لەدایك بوونی ڕێکخراوە ئەهلیو سەندیکای سەربەخۆ ببین کە ڕایەڵەی سەرەکیو بناغەدانەری کۆمەڵگای مەدەنین.

مەکتەبەکانی تر (کۆمەڵایەتی، مافی مرۆڤ، نوێنەران) پشتگیری ڕاکەی کاك نوشیروان دەکەمو پێم وایە جێگەی خۆیان بدەن بەدەزگای تر کە لەبنەڕەتدا کاری ئەوانە، زۆرباشترە.

بۆ نموونە: مەکتەبی کۆمەڵایەتی هەروەك لەوبابەتانەی ئاماژەم پێدان ڕای خۆم نوسیوە بەڵام دووپاتی دەکەمەوە کەپێویستە هەوڵ بدەین دادگاکان کاری خۆیان بکەن بۆ چارەسەری یاسایی کێشەکان، هەروەها پەرلەمان پێویستەچالاك بکرێ ورۆڵی خۆی بەباشی ببینێ . لەوڵاتان محقیق پەرلەمانی (Ombudsman) هەیە کەئەندامی پەرلەمانو شارەزای یاسایەو ڕۆڵی چاودێر دەبینێ لەسەر دامو دەزگاو لێپرسراوە ئیدارییەکان بۆپاراستنی بەرژەوەندی هاوڵاتیان، دەشتوانێ زۆرکێشەی خەڵك چارەسەربکات کە ئاسانکاری زیاتری تیادەبێ بۆ هاووڵاتی کە بەو ڕۆتینیاتانەدا ناڕوا کەلەدادگاکان پەیڕەوی دەکرێن، ئێستا ئەم میتۆدە لەسوئید کاری پێدەکرێ.

**مەكتەبی مافی مرۆڤ:**

مادام وەزارەتی تایبەت بەمافی مرۆڤ هەیەو بودجەو كارمەندی خۆی هەیە، دەكرێ ئەو مەكتەبەش بخرێتەوەسەر ئەو وەزارەتە.

مەكتەبی نوێنەرانی سكرتێری گشتی:

من هیچ جیاوازییەك لەنێوان ئەوكادیرەی ناوی نوێنەری سكرتێری گشتی لێنراوە لەگەڵ هەڤالانی تری كادیر (ل.مەڵبەند) (ل. كۆمیتە) یان ئەندامی مەڵبەند یان كارگێڕ دا نابینم، هەموویان نوێنەری سكرتێری گشتین بەتایبەت ل. مەڵبەند بۆیە ئەم كارە جگە لەناوونیشانێك هیچی ترنیە، هەموو كادیران دەتوانن ئەو كارانە بكەن كە نوێنەر دەیكات.

هێزی پێشمەرگە یان سوپای كوردستان:

هیچ یەك لەپڕۆژەكان دامەزراندنی سوپایەكی نیشتمانی یەكگرتوو كە زەرورەتێكی قۆناغە كەیە باس نەكردووە، هێزی پێشمەرگە سەرمایەیەكی ڕەمزی گەورەی گەلی كوردستانە.بەوپەڕی جوامێریو سەربەرزیەوە ئەركە نیشتمانیو نەتەوەییەكانی خۆی تائێرە سەرەڕای هەندێك كەمو كوڕی بەسەركەوتوویی بەجێ گەیاندووە.. ئەم قۆناغە مێژووییەی كە تێی پەڕاندووە، هیچ دەرفەتێك بۆ پێكهێنانی سوپایەكی یەكگرتوو ومۆدێرن نەڕەخساوە، ئەو، شەڕی مەوجودیەتی گەلەكە مانی دەكرد سەردەمەكەش بێ عەقیدەی سیاسیو حزبێكی سیاسی كە هەموان لەسەر ئامانجەكانی كۆكاتەوە شتێكی تر نەدەڕەخسا... جەبری سەردەمەكە هێزی پێشمەرگەی حزبی هێنابووە مەیدان... بەڵام ئێستا كاتی ئەوە هاتووە هێزی عەقیدەییو حزبی بگۆڕدرێ بەهێزی





نیشتمانیو نەتەوەیی دەبێ هێزی (پ. م) لەسەر وەلای نیشتمانیو نەتەوەیی ڕێك بخرێتەوە، دوور لەدەست تێوەردانی حزبی دوورلە گروپ گەرایی سیاسی، بۆیە پێشنیاردەكەم كە:

١ــ ئەوانەی تەمەنێكیان لەخەبات دا بەسەربردووە خانەنشین بكرێنو بۆئەوەش لیژنەیەكی پسپۆڕ و پێوەرێك دیاری بكات و (پ.م)ی هەموو حزبەكان بگرێتەوە.

٢ـ ئەفسەرانی خاوەن شەهادە بهێڵێتەوەو ئەوانی تر خانەنشین بكرێن.

٣ـ كۆلیژە سەربازیەكان پەرەیان پێ بدرێو هیچ ئەفسەرێك بێ شەهادەی كولێژی سەربازی دانەمەزرێنرێ.

٤ـ بەكەرەستەو چەكی مۆدێرن پڕچەك بكرێن.

٥ــ خولو دەورەی بەردەوام بۆ فێربوونی تەكنۆلۆژیای تازەی سەربازی بكرێتەوە.

٦ــ جگە لە سوپا هیچ كەسو گروپێك بێ مۆڵەت بۆی نەبێ چەك هەڵبگرێو بەتەواوی قەدەغە بكرێت.

٧ـ ئەم سوپایە لێرە بەدواوە سەرباز وەربگرێ لەتەمەنی ١٧ بەسەرەوە بێ پرسیار لەبۆچوونی سیاسی.

لەكۆتایی دا هیوادارم ڕاكانم وەكو بەشدارییەكی بچوك لەو هەڵمەتی خۆنوێ كردنەوەو چاكسازیەدالێ قبوڵبكەنو هیوادارم دڵی كەسم نەهێشاندبێ ئەگەر واش ڕێكەوتبێ داوای لێبوردنی لێ دەكەم چونكە ئامانجم جگە لەچاكسازی وخۆنوێكردنەوەی حزب وحكومەت كە بەرهەمی خوێن

**وفرمیسکی ئەم گەلەستەمدیدەیە هیچی ترنییە..نابێ لەبیریشمان بچێ هیشتا ئـەرکێکی زۆرمـان لەپێـشماوە، کەیـەکێتی وەك باشـترین ئـامراز لەسـەریەتی بیگەنێتـە دوامـەنزڵ گەلەکـەشمان هەرئـەو چـاوەروانیەی لێ هەیـە،بابێ هیـوای نەکەین!**

**پەراوێز:**

**ا-گۆڤـاری ڕێبـازی نـوێ ژمـارە(٢١سـالی٢٠٠٠)بابـەتی"بـەڕێوە بـەرەو کۆنگرە".**

**ب-گۆڤـاری ڕێبـازی نـوێ ژمـارە٢٥سـاڵی٢٠٠٢"بابـەتیحزب وڕێکخـستن لەنێو گۆڕانکاریەکانی سەردەمدا".**

**ت-گۆڤاری نۆڤین ژمارە٧**

**پ-ڕۆژنامەی چاودێرژمارە٧١ ٣\٤\٢٠٠٦**





# دوای چاکسازی !*

* کوردستانی نوێ ژ ٤٠٢٩/٢٥/٧/٢٠٠٦

دەستەواژەی ((دوای چاكسازی)) لەیەكەم تیڕامان دا ڕەنگە مانای خۆی باش نەدا بەدەستەوە، بەتایبەت ئەگەرئەوە بزانین كەچاكسازی، پرۆسەیەكی تالۆزوتێكچرژاوو بەردەوامەو،ماوەیەك یان بۆشایی یەك نییە تیایدا پرۆسەكە ئیستێك بكاتو خالّی كۆتایی دابنێ. بەلاّم بەهەرحالّ دەكرێ ((دوای چاكسازی)) بەو ماوانە بلّێین كە دەكەونە دوای هەنگاوە كرداریە یەك لە دوای یەكەكانی چاكسازی لەبوارە جیاجیا كاندا.ئێستا كە چاكسازی ڕووی لە ئۆرگانی ڕێكخستنە كە بریتی یە لەڕێكخستنەوەی هەیكەلی رێكخستنو هەلّبژاردنو دەست بردنە بۆ پێكهاتەو سەرجەم ئۆرگانە بچوك وگەورەكانی رێكخستن دوای ئەوكردارەكرداری ترو لەبواری تردا دەست پیّ دەكات، دەكرێ بلّێین(( دوای چاكسازی))یبواری رێكخستن ئەوماوەیەیە كە، دەكەوێتە دوای پرۆسەی هەلّبژاردن و بەرئەنجامی پرۆسەكەو دەنگدانەوەوكاریگەریەكانی پرۆسەكەوچۆنێتی وەرگرتنوئەندازەی رەنكردنەوەی لەلایەن جەماوەری رێكخستنو كادیرانەوە،ئەنجامە سلبیو ئیجابییە كانی دەگرێتەخۆ، من پێم وایە پرۆسەیەكی ئاوا كەتوندپەیوەستە بە باوەڕی سیاسی تاكی یەكێتیو ژیانو گوزەرانی ئەوتاكەو سەرجەم ئەندامانی خێزانەكەیو ئەوسۆزو پەیوەستە رۆحی





یە مێژووی یەی كەئەوتاكانە لەپرۆسەی مێژوویەكی شورشگێرانەی دوورو درێژدا كە هەلّگری دەیان برینی رۆحیو سەروەری رۆحی و ماددیە وتەمەنی گەنجی زۆربەی زۆری كادیرانی ئەو حزبەی لەگەلّ خۆی پێچاوە تەوە، هێندە ئاسان نییە سەرپێیی بەسەریدا بگوزەرێو بەپێوەرێكی دوور لەهەلو مەرجی مێژوویی، سیاسی، كۆمەلاّیەتی كوردەواری بپێورێ! هەقە ووربینانەو لەزەمان وزەمینی ئێستای كوردستان دا مامەلّە لەگەلّ ڕیفۆرم بەگشتیو ڕیفۆرمی ڕیكخستن بەتاییەتی بكرێ .

من ریكخستن بەرۆحو بونیادی یەكێتی تێدەگەم پێموایە هەر ئۆرگانو دەزگایەكی یەكێتی لەریفۆم وڕێكخستنەوەدا هەلّەشی تیدا بكرێ زیانێكی نسبی بەیەكێتی دەكەوێو زووش چارەسەر دەكرێ ! بەلاّم رێكخستن كە سیماو خەسلّەتێكی ئالۆزو هەمەلایەنی هەیەو تاكەكانی مرۆڤی سیاسین كە سالّەها خۆبەخشانە بەخۆینو مالّ لەو ئۆرگانەدا تێكۆشاون، حەساسو ناسكەو هەر هەلّەیەك یان خراپ تێگەیشتنێك لە دەستكاری كردن دا بەرەنجامێكی خراپو چاكردنەوشی كاتو وەزەیەكی زیاتری دەوێ!

دەست بردن بۆ رێكخستن، دەست بردنە بۆ ئەخلاقیاتی حزبو بەها ڕەمزیەكانی، لێرە شەوە سەرجەم بەهای ئەفلاقیوسیاسی تاكەكان دەگرێتەوە ئەگەریاساو لانی كەمی عەدالەت لەپرۆسەكەدا پێرەو نەكرێو لەلایەكی تریشەوە خودی سەرپەرشتیكردن وبەڕێوەبردنی پرۆسەكە بەكەسانی پاك وبێ لایەنو ووشیار نە سپێررێ زەمەنی دوای پرۆسە كە دەبینین كەپڕدەبێ لەشێواویو ڕەخنەو ڕەتكردنەوە ! بۆیە دەبێ هەر لە هەنگاوی یەكەمەوە ماوەی دوای چاكسازی شەنو كەوبكەین، چەندە بەرنامەو پرۆسەكە موتوربە

بەلێكدانەوەی قوڵو دەستی پاك وبێ لایەن بێ، هێندە زەمینی دوای چاكسازی بێ هەڵەوپەڵە دەكەوێتەوە و بەپێچەوانە شەوە چەندە تەكتول بازی یاری خۆی تێدا بكاتو كادیری ڕاستەقینە بخریتە پەراوێزە وە كەسانی ماستاوچیو سینگ لەپێشو زمان لوس، پیاوپیا وێنەی تیدابكەن هیندە ناعەدالەتیو بی یاسایی پەرێزی پرۆسەكە دادەپۆشێو دوای چاكسازی خۆمان لەبەردەم ئەسەفی كادیرانو ڕەخنەی جەماوەردا دەبینینەوەو لەجیاتی یەكێتی هێزو ووزەی وەرگرتبێو خۆینی نوێی تێزابێ، بەخوێنی پیس ئالۆدە دەبێ كە بەرئەنجامەكەی لاوازیو نەخۆشی دەبێو چاكردنەوە شی وزەوكاتێكی زۆر تری دەوێ .

بۆیە هەقەپێش ئەوەی كار لە كار بترازێ، بیری ووردی بۆ بكرێتەوە و هەمووئەو ڕەخنەوسرنجانە بەهەند وەربگیرێنو سەرپەرشتی پرۆسەكەش لە كەسانی پاكو ئەوەندەی دەكرێ سەربەخۆبنو دووربن لە تەكەتولچیە ناسراوەكان و چاودێریەكی ووردیش بكرێو كەمترین پێشێلكردنی پەیرەوەی پرۆسەكە لێپرسینەوەی لەگەلدابێ بۆئەوەی دوای چاكسازی بەسەری بلندەوە ئاوڕ لە پرۆسەكە بدەینەوەو جەماوەریش بەدلگەرمیەوە پێشوازیمان لێبكاو دەست خۆشانەمان پیێ بلێ.

لە وەتەی چاكسازی دەنگی داوەتەوە ونوسینەكەی كاك نوشیروان كە وتۆتە بەرچاوانوپێشتریش ج مەكتەبی ریكخستنو چ كادیرانی چەندكەسی وچ بەتاكی، بابەت و پرۆژەی جیاجیایان لە ڕۆژنامەكاندا بلاوكردۆتەوە ، دەنگی ڕەخنەو سرنجی جۆر بەجۆر دەركەوتون،ئەوەش ئەگەرهیچ ئاماژەیەك بدا ئاماژەی ناكاملی و تێرنەكردنی كادیرانە، پیێ دەچێ پرۆسەكە لە چاوئەو





ئالۆزیو گرنگیەی، لە هەنگاوی بە كردەوەدا پەلەی پێوە دیاربێ كەئەمەش لەگەڵ ڕۆحی ریفۆرم وەك پرۆسە یەكی هێواشو بەرنامەرێژو ئالۆز نایە تەوە .

سرنجو ڕەخنەو پێشنیازە كانی سەرجەم مەڵبەندەكان لەمەكتەب رێكخستن كۆكراونەتەوەو لەوێوە بەراپۆرتی تایبەت خراونەتە بەردەم (م .س) ینی بەرێز، گروپی پێرەوانی پەیرەو كۆمەڵێك خاڵی گرنگیان لەڕۆژنامەی چاودێر هەفتەی ڕابردوو بلاو كردۆتەوە، لێر لەوێش بەنوسین چ بەگفتوگۆ، قسە لە خاڵەلاوازو بەهێزەكانی پرۆسەكە دەكرێ، ئەمانە هەموو ئەگەر هیچ ئاماژەیەكیان لەپشتەوەبێ ئەوە دەسە لمێنن كە ئەم پرۆسەیە پێوسیتی بەلێكدانەوەی زیاترو هەلسەنگاندنی زیاترو هەمەلایەن هەیەو دەخوازێ كۆئیرادەی كادیرانو جەماوەری رێكخستنی زیاتربۆسازبدرێ بۆ ئەوەی بەشێوەیەكی تۆكمەو جدیو لێبراوانە بەهەنگاوی بەرنامەرێژ، دەست پیێ بكرێو پسانەوەشی نەبێ .. واتە لێرە بە دواوە چاكسازی ببێ بەئەركێكی بەردەوامو گشتیو شۆڕببێتەوە بۆ سەرجەم ئۆرگانو باوەربی تاكەكانی یەكێتیو لەوێشەوە بۆ ناو قوڵایی كۆمەڵگا،چونكە ئەگەر حزب ئامرازی رزگاری و پێشخستنی كۆمەلگابێ، گۆڕان و چاكسازی لەیەكێتی دا سەرەتای وەرگۆڕانێكی نوێش دەبێ لەكۆمەڵگای كوردیدا.

